# کورتەیەک
# دەربارەی
# ئۆتیزم

د. ناصح قەرەداغی

٢٠٢١

An Introduction to Autism Spectrum Disorder
(In Kurdish)
Written by Dr. Nasih Othman
2021

ناوەرۆک



چاپی یەکەمی ئەلکترۆنی، ٢٠٢١

١

## پێناسه وسەرەتایەکی مێژوویی

ئۆتیزم کێشەیەکی ئاڵۆزی پەرەسەندنی نیورۆلۆژیکییە کە پەیوەندیی بە گەشەو پەرەسەندنی مێشکەوە هەیە لە سەرەتای منداڵیدا. چەمکی ئۆتیزم لە کۆنەوە تا ێستا گۆرانکاریی زۆری بەسەردا هاتووە و لێکدانەوەی جۆراوجۆری بۆ کراوە. بەپێی دوا پۆلێنیی کۆمەڵەی دەروونپزیشکانی ئەمەریکا ئەم حاڵەتە وەک شەبەنگێک یا پانتاییەک ناوبراوە (کێشەی پانتایی ئۆتیزم- Autism Spectrum Disorder) نەک وەک نەخۆشیەکی دیاریکراو چونکە دەستنیشانکردنی ئاسان نیەو نیشانە و رادەی دژواریی و هۆیەکانی زۆر و بەرفراوانن و پانتاییەکی زۆر دەگرنەوە. نیشانە سەرەکییەکانی ئۆتیزم بریتین لە کەموکوڕیی لە توانستی گەیاندنی کۆمەلایەتی و پەیوەندی کردن لەگەڵ خەڵک و، ئەنجامدانی رەفتارو کاری دووبارە کە پێناچێ هیچ مەبەستێکی هەبێ. دەستنیشانکردنی ئۆتیزم هێشتا لەسەر بنەمای نیشانەیە و تێست و مارکەرێکی (نیشاندەرێکی) بایۆلۆژیی تایبەتیی نیە بۆ دەستنیشانکردنی یەکجارەکی و هێشتا لە ریزی نەخۆشییە دەروونییەکاندا ئاماژەی پێ دەکرێ. بێگومان

ئۆتیزم کێشەیەکی کۆنە و مادام گرفتێکە لە پەرەسەندنی نیورۆلۆژیکی و گەشەی منداڵدا، کەواتە ئەبێ هەمیشە کەم تازۆر هەبووبێ. لە سەدەکانی رابردوودا هەندێ حاڵەت باسکراون لە مێژووی کۆمـەڵایەتی و پزیشکیدا کە رەنگە بە پێناسەی ئەمرۆ کەسانی ئۆتیزمدار واتە ئۆتیست بووبن. بۆ نموونە یەکێک لەو کەسایەتییانەی کە واباوەڕدەکرێت ئۆتیزمیان هەبووبێت یەکێکە لە شوێنکەوتووانی سانت فرانسیزی ئاسیزی لە سەدەی دوازدەیەمدا بە ناوی براخاس جونیپەر بەپێی شێوەی باسکردنی. وتراوە جونیپەر کەسێکی لەرادەبەدەر دڵساف و سەرڕاست بووە و لەتوانایدا نەبووە بزانێ ئەو شتانەی ئەیکات یان ئەیڵێت ئەنجامی چییان لێدەکەوێتەوە. هەرلەبەر ئەم ساویلکەیی و دڵسافی و رەفتاری سەیرو دووبارەیەی بووەتە مایەی گاڵتەی خەڵک و ناتۆرەی 'مەزەی خوایی' یان لێناوە (ماکدۆگڵ،٢٠١٦). ئۆتیزم نەخۆشییەک نیە لە سەردەمێکی دیاریکراودا سەری هەڵدابیت بەڵکوو کەموکووڕییەکی پەرەسەندنە کە ئەبێ هەر هەبووبێ بەڵام لە سەردەمی پێش هاتنەئارای زاراوەی ئۆتیزم دا رەنگە ئەو منداڵانەی ئۆتیزمیان هەبووە بە پێی دابونەریتی کۆمەلایەتی سەردەم تەماشاکرابن و لێکدانەوەی سوپەرسروشتی و پەروەردەیی و رەفتاریی و دەروونییان بۆ کرابێت. نموونەیەکی تر کە دەوترێت رەنگە ئۆتیزم بووبێت

کوڕێکی وێڵە بەناوی ڤیکتۆر کە لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمدا لە دارستانەکانی ئاڤەریۆنی ناوەراستی فەرەنسادا بە وێڵی دۆزراوەتەوە و پزیشکێک بە ناوی ژانمارک گاسپار ئیتارد بۆ ماوەی ٥ ساڵ لێکۆڵینەوەی لەسەرکردووە و باسی حاڵەتەکەی کردووە (ماکدۆگڵ،٢٠١٦). بەپێی یاداشتەکانی ئیتارد ڤیکتۆر کێشەی هەبووە لە پەیوەندیکردن و مامەڵە لەگەڵ خەلکدا، بەردەوام بەملاولادا خۆی جووڵاندووە و جگە لەوەش هەندێ کێشەی هەبووە لە دەرکپێکردنی هەستیدا. ئیتارد کاری زۆری لەگەڵ ڤیکتۆر کردەوە و هەوڵی داوە فێری هەندێ وشە و رەفتاری کردووە و شێوازی تازەی هێناوەتە کایە بۆ فێرکردنی ئەو منداڵانەی دواکەوتنیان هەیە لە پەرەسەندندا.

وشەی ئۆتیزم کە لە وشەی 'ئۆتۆس' ی یۆنانیەوە بە مانای 'خود' وەرگیراوە، بۆ یەکەمجار ساڵی ١٩١١ لەلایەن دەروونپزیشکی سویسرائییەوە بە ناوی ئیوجین بلۆیلەر بەکارهێنراوە بەڵام نەک بۆ باسی ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەڵێین ئۆتیزم بەڵکو وەک یەکێک لە نیشانەکانی نەخۆشی شیزۆفرینیا (لیبۆیەر،٢٠١٥). بلۆیلەر بیرکردنەوەی ئۆتیستیی وەک نیشانەیەکی شیزۆفرینیا باسکردووە کە بریتی بووە لەوەی نەخۆش حەزی مناڵانەی هەیە بۆ خۆلادان لەو واقیعانەی بە دڵی ئەو نین

و جێگرتنەوەیان بە خەیاڵات و هەلوەسە. بە واتایەکی تر نەخۆشی شیزۆفرینیا کە ئەم نیشانەیەی هەیە دا بڕاوە لە واقیع و هەر شتێکی بە دڵ نەبێت خۆی لێ گێل دەکات و لەبری ئەوە خۆی دەداتە دەست فەنتازیا و هەلوەسە بۆ رازیکردنی خۆی. کەواتە 'ئۆتیزم' بەشێوەیەک بریتی بوو لە 'ژیانی ناوەوە' ی نەخۆشەکە کە خەڵکی تر بەئاسانی دەستیان پێ ناگات و لێی تێناگەن. بەهەرحاڵ باسکردنی ئۆتیزم وەک حاڵەتێکی پزیشکیی دیاریکراو زۆر نوێیە و یەکەم باسکردنی دەگێڕنەوە بۆ پزیشکێک بە ناوی لیۆ کانەر لە ئەمەریکا کە لەساڵانی سییەکانی سەدەی بیستەمدا باسی هەندێ نیشانەی ئۆتیزمی کردووە لە ژمارەیەک منداڵدا کە لێکۆڵینەوەی لەسەرکردوون (ماکدۆگڵ،٢٠١٦). کانەر باسی لە کەموکوڕی عاتیفی و دوورەپەریزی و رەفتاری دووبارەو درەنگ فێربوونی لاساییکردنەوەی قسە کردووە لەو منداڵانەدا و ئەمانەی بە حاڵەتی ئۆتیزم ناوبردووە. کارنەر دواتر لەگەڵ هاوکارەکانیدا دوو نیشانەی دیاریکەری خستەروو کە پێویستە لە منداڵدا هەبن بۆ ئەوەی بە ئۆتیزم دەستنیشان بکریت. یەکەمیان نەبوونی پەیوەندی گەرم و عاتیفی و دووەمیشیان رەفتاری دووبارەو و سەیرو ناماقووڵ. لەهەمان کاتدا کە کانەر لە کلینیکەکەی لە ئەمەریکا خەریکی کارکردن بوو لەسەر ئەم منداڵانە، پزیشکێک لە ڤیەننا بەناوی کارڵ ئەسپێرگەر کاری لە سەر چارەسەری

٤ کوڕی تەمەن شەش تا یازدە ساڵە دەکرد کە بەقسەی خۆی ڕەفتاری ئۆتیستییان هەبوو. ئەم منداڵانە وەک ئەسپێرگەر باسی کردوون هەندێ سیفەتان هەبووە وەک کەموکووڕیی لە پەیوەندیی کۆمەلایەتی، ترس لە گۆڕانکاریی دەوروبەر، کەمی تەعبیری دەموچاو، تۆنی قسەکردنی نائاسایی، وەسواسی و حەزی سەیر، توانستی مەعریفی جیاواز، ڕەفتارو کرداری دووبارە. نەخۆشەکانی ئەسپێرگەر وەک ئەوانەی کانەر کێشەی گەورەیان نەبووە لە زمان و قسەکردن و توانستی مەعریفیدا. لەراستیدا ئەسپێرگەر وەک کێشەی کەسایەتی باسی لێکردوون نەک کێشەی پەرەسەندن. هەرچەندە ئەسپێرگەر پێش کانەر باسی لە ئۆتیزمی منداڵ کردووە و دیار نیە ئاخۆ کانەر ئاگای لە ئەسپیرگەر هەبوە یان نا، بەڵام لەبەرئەوەی ئەسپێرگەر بە ئەڵمانی توێژینەوەکانی بڵاوکرۆتەوە، ئەوەندەی کانەر ڕۆڵی نەبووە لە پێشخستنی چەمکی ئۆتیزمدا. بەهەرحاڵ پاش چەندین دەیە کە بەرهەمەکانی ئەسپێرگەر تەرجەمە کران بۆ ئینگلیزی، وەک ریزلێنان، ئەو جۆرە حاڵەتەی باسی لێکردبوون ناونرا سیندرۆمی ئەسپێەرگەر کە ئێستا ئەکەوێتە ژێر پۆلێنی ئۆتیزمەوە.

بەکارهێنانی وشەی ئۆتیزم بۆ باسکردنی خاسیەتی شیزۆفرینیایی نەخۆشییە دەروونییەکان لە بواری

شیزۆفرینیای گەورەساڵاندا ساڵانێک باوبوو. لە چاپی یەکەمی ڕێنمای پۆلێنی نەخۆشییە عەقڵییەکاندا کە ساڵی ١٩٥٠ کۆمەڵەی دەروونپزیشکانی ئەمەریکا بڵاوی کردەوە ئۆتیزم وەک حاڵەتێکی سەربەخۆ هەبوونی نیە بەڵکوو وەک کاردانەوی شیزۆفرینیایی لە منداڵدا باسی لێکراوە. لەچاپی دووەمیشدا کە ساڵی ١٩٦٨ دەرچوو هەمان پۆڵێن بەردەوامە واتە ئۆتیزم وەک شێوەی منداڵانەی شیزۆفرینا باسکراوە وبەشێک "لەو حاڵەتانە دەگرێتەوە کە نیشانەکانی شیزۆفرینیا پێش باڵقبوون دەردەکەون." لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی بیستەم بەدواوە دەروونپزیشکانی منداڵ بەتایبەتی لە بەریتانیا ئەم بۆچوونەیان خستە ژێر پرسیار و لە ئەنجامی کارو توێژینەوەکانیاندا گۆرانکاریی بنەرەتییان بەسەر ئەم لێکدانەوەیەدا هێنا سەبارەت بە منداڵی ئۆتیست (ئۆتیزمدار). لە کاتێکدا پێشتر وادەزانرا کە منداڵی ئۆتیست لە خەیاڵ و فەنتازیادا دەژی، ئەمانە بۆچوونێکی پێچەوانەیان هەبوو، بۆ نموونە دەروونپزیشکێکی بەریتانیایی بەناوی مایکڵ روتەر لە ساڵی ١٩٧٢ دا رایگەیاند کەوا 'منداڵی ئۆتیست فەنتازیای زیادەی نیە بەڵکوو کەموکووڕیی هەیە لەوڕووەوە (ئیڤانس،٢٠١٧). رووتەر کە بە یەکێک لە پێشەنگانی دەروونپزیشکیی و دەروونزانی منداڵ دادەنرێت لە بەریتانیا، چوار نیشانەی

دیاریکەری پێشنیارکرد بۆ پێناسەی ئۆتیزم کە برتتی بوون لەمانە(لیبۆیەر،٢٠١٥):

١. کەموکوورِی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کە لەگەڵ ئاستی ژیریی منداڵەکەدا ناگونجێت.
٢. دواکەوتن یا کەموکورِیی فێربوونی زمان کە لەگەڵ ئاستی ژیریی منداڵەکەدا ناگونجێت.
٣. خواستی نەگۆرِی کە دەبێتە هۆی دووبارەکردنەوەی هەمان یاری و خۆمەشغوولکردنی سەیر و رێگرتن لە گۆرِان.
٤. سەرهەلدانی ئەم کێشانە پێش تەمەنی ٣٠ مانگی.

لەئەنجامی ئەم پێشکەوتنانەدا لە بواری ناساندنی ئۆتیزم، سەرەنجام ساڵی ١٩٨٠ کۆمەڵەی دەروونپزیشکانی ئەمەریکا کە چاپی سێیەمی رِێنمای پۆلێنی نەخۆشییە عەقڵییەکانی بڵاوکردەوە (DSM-III) ئۆتیزمی وەک نەخۆشییەک یا راستتر بڵێین وەک حاڵەتێکی جیاواز ناساند و جیای کردەوە لە شیزۆفرینیای منداڵی و لە ژێر ناوی 'ئۆتیزمی منداڵی' دا تۆماری کرد. هەرچەندە 'ئۆتیزمی منداڵی' لە ژێر گرووپێکدا بوو بە ناوی کیشەی بەربڵاوی پەرەسەندن بەڵام مەرجی تایبەت

بەخۆی بۆ دیاریکراوە. لە DSM-III دا ئۆتیزمی منداڵی بەم شێوەیەی خوارەو پێناسە کراوە:

١. سەرهەڵدان پێش تەمەنی ٣٠ مانگی
٢. نەبوونی بەربڵاوی وەڵامدەیی بۆ خەڵکی تر (ئۆتیزم)
٣. کەموکووریی زۆر لە پەرەسەندنی زماندا
٤. ئەگەر توانای قسەکردنی هەبێت، پاتێرنی سەیری قسەکردن وەک لاساییکردنەوەی کوتوپڕ یا درەنگ، زمانی رەمزی، بەهەڵە بەکارهێنانی ڕاناو.
٥. وەلامدانەوەی سەیرو سەمەرە بۆ دەوەروبەر بۆنموونە رێگرتن لە گۆران، مەیلی سەیر بۆ ئەڵوەدابوون لەگەڵ شتی زیندوو و نازیندوو.

وەک چاوەروان دەکرا و لەبەرئەوەی ئۆتیزم مەسەلەیەکی ئاڵۆز بوو، هێشتا بیروڕای جیاواز لەسەری هەبوو وە هۆیەکانی نەزانراو بوون، ئەم پێناسەیە بەردەوام لە چاپ و پێداچوونەوەکانی داهاتووی DSM دا گۆڕانکاری بەسەردا هات. پێداچوونەوەی سێیەم مەرجەکانی پیناسەکەی زیاتر روونکردەوەو هەشت مەرجی لەژێر ٣ لایەندا رێکخست کە دەبوایە لانی کەم کەسەکە هەشت مەرجی تێدا بێت تا بە ئۆتیزمی منداڵی دابنرێت. لە چاپی چوارەمی (DSM-IV) دا کە ساڵی

١٩٩٤ بڵاوكرایەوە، ناوی نەخۆشییەكە لە (ئۆتیزمی منداڵی) یەوە گۆڕا بۆ (كێشەی ئۆتیستی) و بە پێناسەیەكەی پێشوو هەندێ گۆرانكاری بەسەردا هات بۆئەوەی زیاتر لەگەڵ لایەنی پەرەسەندنی منداڵ و بواری توێژینەوە و پێناسەی رێكخراوی تەندروستیی جیهانیدا (ICD-10) بگونجێت. بەكارهێنانی ئەم پێناسەیە كە دواتر هەندێ گۆرانكاری تریشی بەسەردا هێنرا بەردەوام بوو تا دوا چاپی (DSM) واتە چاپی پێنجەم (DSM-V) كە ساڵی٢٠١٣ بڵاوكرایەوە و ناوی حاڵەتەكەی گۆڕی بە (كێشەی پانتایی ئۆتیزم).

پێناسە تازەكە هەموو ئەو كەسانە دەگرێتەوە كە لە چاپی چوارەمدا بە كێشەی ئۆتیستی و بە كۆنیشانەی ئەسپێرگەر و بە كێشەی بەربڵاوی پەرەسەندنی نادیاریكراو ناوبرابوون. كۆنیشانەی ئەسپێرگەر نیشانە رەفتارییاكانی ئۆتیزمی هەیە واتە كەموكووریی پەیوەدنی كۆمەڵایەتی وزمانی جەستەو رەفتاری دووبارە بەڵام دواكەتنی زمان و مەعریفیی و كەمتوانایی فێربوونی لەگەڵ نیە. ئەم منداڵانە ئەگەر لەسەرەتاشدا هەندێ خاوییان پێوە دیاربێت لە زمانگرتنیدا عادەتەن لە پێنج ساڵئدا تەواو قسەدەكەن و كە گەورەتر دەبن مەیلیان بۆ خەڵك باشتر دەبێت. كێشەی بەربڵاوی پەرەسەندنی نادیاریكراو(PDD-NOS) بریتییە لە دەستنیشانكردنێكی

(تەشخیسێکی) کەمێک تەماوی کە ئەو منداڵانە دەگرێتەوە کە کەموکوڕیی زۆرو بەربڵاویان هەیە لە گەشەی پەیوەندیکردنی کۆمەڵایەتی و بەرامبەر و لە توانستی زمانی قسەیی و ناقسەییدا بەڵام لەژێر هیچ پێناسەیەکی تردا جێیان نابێتەوە چونکە مەرجەکانی هیچ تەشخیسێکی دیریکراویان تێدا نیە بۆیە بەجیا لەژێر گرووپی کێشەی بەربڵاوی پەرەسەندنی نادیاریکراو دانراون کە ئەمیش خۆی لە ژێر کێشەی پانتایی ئۆتیزمدایە.

سەبارەت بە ئۆتیزم لە پۆلێنی نیودەوڵەتیی نەخۆشییەکان چاپی ١٠ دا کە بریتییە لەپۆلێنی رێکخراوی تەندروستیی جیهانی بۆ نەخۆشییەکان، باس لە کێشەی بەربڵاوی پەرەسەندن و ئۆتیزمی منداڵی و ئۆتیزمی ناتیپیکاڵ و کۆنیشانەی ئەسپێرگەر کراوە و هەموو لەژێر دەستەیەک حاڵەتدا بەناوی 'کێشە عەقڵی و رەفتارییەکان' کۆکراونەتەوە (موورای،٢٠١٢). بەپێی ئەم پێناسەیەی رێکخراوی تەندروستیی جیهانی ئۆتیزمی منداڵی جۆرێکە لە کێشەی بەربڵاوی پەرەسەندن کە بە چەند نێشانەیەک دەناسرێتەوە کە ئەمانەن. ١)کەموموورِی پەرەسەندن کە پێش تەمەنی ٣ساڵی خۆی دەنوێنێت، ٢)کەموکووڕی و خراپ کارکردنی لایەنی دەروونی وەک کەمووکووڕی گەیاندن و پەیوەندیکردنی کۆمەڵایەتی و رەفتاری دووبارەو سنووردار. جگە لەم

نیشانانە کە تایبەتن بە ئۆتیزمی منداڵی هەندێ نیشانەی تریش باون لە کەسی ئۆتیزمدا وەک توورەیی و هەڵچوونی نائاسایی، گرفتی نووستن و خواردن، ترس و فۆبیا و زیان بەخۆگەیاندن.

لە خوارەوە بە درێژی دوا پێناسەی ئۆتیزم واتە 'کێشەی پانتایی ئۆتیزم' دەخەینە ڕوو کە لە چاپی پێنجەمی پۆلێنی کۆمەڵەی دەروونپزیشکانی ئەمەریکادا هاتووە و ئێستا بە شێوەیەکی بەربڵاو لە بواری کلینیکی و توێژینەوەدا کاری پێدەکرێت و وەک وتمان هەرسێ حاڵەتی کێشەی ئۆتیستی و کۆنیشانەی ئەسپێرگەر و کێشەی بەربڵاوی پەرەسەندنی نادیاریکراو دەگرێتەوە. مەرج و نیشانەکانی ئۆتیزم بەپێی ئەم پێناسەیە لەژێر دوو چەمکی کۆمەڵایەتی و رەفتاریدا کۆکراونەتەوە (کارپێنتەر،٢٠١٣).

<u>**یەکەم:**</u> کەموکوورییەکی بەردەوام لە گەیاندنی کۆمەڵایەتی و پەیوەندیکردنی کۆمەڵایەتی لە بارودۆخی جیاوازدا، کە ناتوانین بڵێین بەهۆی دواکەوتنی گشتیی پەرەسەندنەوەیە، و پێویستیشە ئەم کەموکوورییە لە هەرسێ لایەنەکەی لای خوارەوەدا خۆی بنوێنێ:

١. کەموکوورِی لە وەڵامدانەوەی بەرامبەردا لە رووی کۆمەڵایەتی و عاتیفیەوە. ئەمەش هەر لەو رادەیەوە کە نەتوانێ بە شێوەیەکی نۆرماڵ پەیوەندی کۆمەلایەتی دەست پێبکات یان نەتوانێ وەک نۆرماڵ گفتوگۆ دریژەپێبدات بەهۆی کەمبوونەوەی مەیلی بەشداری، کەمیی عاتیفەو هەست و سۆز ، کەمیی واڵامدەیی تا ئەورِادەیەی بە هیچ جۆریک نەتوانێ پەیوەندی کۆمەلایەتی دەست پێ بکات.

٢. کەمووکوورِی لە رەفتاری گەیاندنی ناقسەییدا کە لە پەیوەندیکردنی کۆمەلایەتیدا بەکاردەهێنرێن. ئەمەش هەر لەو رادەیەوە وەک ئەوەی گەیاندنی قسەیی و ناقسەیی بە باشی یەکانگیر نەبن و لەگەڵ یەک نەگونجێن، یان نۆرماڵ نەبوونی چاو لە چاو رِوانین و زمانی جەستە، یانیش کەموکوورِی لە تێگەیشتن و بەکارهێنانی گەیاندنی ناقسەیی، تا ئەرِادەیەی بە هێچ جۆرێک دەربرِینی دەموچاو و ئیشارەت هەبوونی نەبێت.

٣. کەموکوورِی لە دروستکردن و درێژەپێدانی پەیوەندی لەگەڵ خەڵک (بێجگە لە بەخێوکەر) کە گونجاو بێت بۆ لەگەڵ قۆناغی پەرەسەندندا. ئەمەش هەر لەو رادەیەوە کە گرفتی هەبێت لە گونجاندنی رەفتاردا بەپێی جیاوازیی بارودۆخی کۆمەلایەتی، تا گرفت لە

بەشداریی ماقووڵی یاریکردن  هاوڕێیەتی بەستن، تا ئەڕادەیەی کە وادەردەکەویت هیچ مەیلێکی نەبێت بۆ خەڵکی.

**دووەم:** شێوازی سنووردارکەرو دووبارە لە رەفتار و مەیل و چالاکیدا کە پێویستە بەلای کەمەوە لە دووان لەم چوارلایانەی لای خوارەوەدا خۆی بنوێنێ:

١. دووبارەکردنەوەو ستیرۆتایپی لە قسەکردن و جووڵەی لەش و بەکارهێنانی شتەکاندا، بۆ نموونە جووڵاندنی دووبارەی بەشیکی لەش و وتنەوەی قسەو بەکەرهێنانی دووبارەی شتێک یان دەستەواژەیەکی سەیری تایبەت بەخۆی.

٢. پابەندبوونی لەرادەبەدەر بە رۆتین و شیوازی بێمانای رەفتاری قسەیی و ناقسەیی، یان ڕێگری لەرادەبەدەر لە گۆڕان. بۆ نموونە جووڵەی دووبارەی بێمانا، وڕکگرتن بۆ هەمان شێوەی نانخواردن، پرسیارکردنی دووبارە، و بێزاریی لەرادەبەدەر لە هەر گۆرانکارییەک با کەمیش بێت.

٣. مەیلی ئێجگار سنووردار و چەقبەستوو کە لەڕووی رادەی توندی و  فۆکەسەوە نۆرماڵ نیە. بۆ نموونە ئێجگار ئەلوەدابوون یان خۆخەریک کردن بە

شتومەکی نائاساییەوە، یاخود حەزو مەیلی لەرادەبەدەر سەرسەختانەو و سنووردار.

٤. کاردانەوەی کەمتر یا زیاتر لە نۆرماڵ بۆ بزوێنەری هەستی یاخود حزو مەیلی نائاسایی بۆ لایەنە هەستییەکانی دەوروبەر. بۆ نموونە بەرواڵەت گوێنەدان بە ئازار و گەرمی و ساردی، وەلامدانەوەی پێچەوانە بۆ هەندێ دەنگ و تێکسچەری دیاریکراو، بۆنکردن و دەستلیدانی لەرادەبەدەری شتومەک، سەرسامبوون بە رووناکی و شتی خولاوە.

وەک لەم دوا پێناسەیەی سەرەوەدا دیارە مەرجەکانی دەستنیشانکردنی ئۆتیزم لەژێر دوو چەمکی سەرەکیدا ریزکران کە بریتین لە کەموکوڕی لە گەیاندن و پەیوەندیکردنی کۆمەلایەتی، و هەبوونی رەفتاری دووبارەو سنووردارکەر. لە ژێر هەرکام لەم دوو چەمکەدا ژمارەیەک لایەن و نیشانە هەن و هەرلایەنکێش پانتاییەکەی فراوان دەگرێتەوە لە دژوارییی نیشانەکاندا. وەک لە سەرەوە باس کرا، بۆ دەستنیشانکردنی ئۆتیزم پێویستە هەرسێ لایەنی یەکەم و لانی کەم دوو لایان لە ٤ لایەنی دووەم بوونیان هەبێ . ئەم کەموکوڕی و نیشانانە پێویستە لە سالانی سەرەتای منداڵییەوە خۆیان نیشان دابێ. لە بەشی داهاتوودا بەدرێژی باسی نیشانەکان

دەکەین و نموونەیان بۆ دەهێنینەوە و باس لە رادەی دژواریی حاڵەتەکە دەکەین.

## ٢

## نیشانەکانی ئۆتیزم

لەوەتی ئۆتیزم وەک حاڵەتێکی دیاریکراوی منداڵی ناسراوە، هەمیشە وەک کێشەیەکی بەربڵاوی پەرەسەندنی منداڵ باسکراوە واتە ناتەواوی و لادانێک لە نۆرماڵی گەشەو پەرەسەندنی منداڵ کە رەنگدانەوەی دەبێت لەسەر پەرەسەندنی نیورۆلۆژیکی و کۆمەلایەتی و رەفتاری و دەروونی. کەواتە دەرکەوتنی ئۆتیزم و لە تەمەنێکی زوو لە منداڵیەوە تێبینی دەکرێت و وردەوردە لەگەڵ گەشەی منداڵدا زیاتر دەردەکەێت. لەراستیدا باوەر وایە کە هەندێ لە نیشانەکانی ئۆتیزم رەنگە لە تەمەنی یەک ساڵییەوە تێبینی بکرێن و دەکرێت ئۆتیزم لە تەمەنی دوو ساڵیدا بە یەکجاری دەستنیشان بکرێت. بەهەحاڵ لەواقیعدا ئەمە کاریکی ئاسان نیە و دەستنیشانکردنی یەکجارەکی زۆر درەنگتر روودەدات چونکە منداڵان لە گەشەو پەرەسەندندا چوونیەک نین نیشانەکانی ئۆتیزم رەنگە لەگەڵ مەودا جیاوازەکانی گەشەی منداڵدا تێکەڵ ببن کە وەک ئاشکرایە هەموو منداڵان لەهەمان تەمەندا ناگەنە هەمان قۆناغ. بۆ نموونە منداڵان هەموو لەیەک تەمەندا فێری قسە نابن بۆیە لەوانەیە ئەو دواکەوتنەی لە رووی قسەکردنەوە لە منداڵێکدا روودەدات کە سەرەنجام

دەردەچێت ئۆتیزمی هەیە لەکاتی خۆیدا وەک دواکەوتنێک لە چوارچێوەی مەودای ئاساییدا سەیرکرابێ.

بەپێی دوا پێناسەی ئۆتیزم وەک پێشووتر باسمان کرد نیشانەکانی ئۆتیزم لە چوارچێوەی دوو چەمکی سەرەکیدا خۆیان دەبیننەوە کە بریتین لە کەموکووڕی لە گەیاندن و پەیوەندیکردنی کۆمەڵایەتی و هەبوونی شێوازی سنووردارکەرو دووبارە لە رەفتار و مەیل و چالاکیدا. چەمکی یەکەم ٣ لایەن و چەمکی دووم ٤ لایەن دەگرێتەوە کە لەخوارەوە بە درێژو بە نموونەوە باس کراون. بۆئەوەی کەسێک وەک ئۆتیزم دەستنیشان بکرێت پێویستە نیشانەی هەبێت لە هەرسێ لایەنی یەک و دوو و سێ، وە نیشانەشی هەبێت لە لانی کەم دوو لایەن لە لایەنەکانی چوار تا حەوت (کارپێنتەر، ٢٠١٣؛دورانت،٢٠١٤).

١. هەندێک لە نیشانەکانی ئۆتیزم پەیوەندییان بە کەموکووریی لایەنی پەیوەندیکردنی کۆمەلایەتی و عاتیفیەوە هەیە وەک ئەوەی نەزانێ چۆن لە خەڵک بچیتە پێشەوە و مامەڵەیان لەگەڵ بکات بۆ نموونە بەشێوەیەکی سەیر لێت نزیک بێتەوە، دەستت لێ بدات یان بتلێسێتەوە وەک ئەوەی بە شتێکت تێبگات. لاوازی بەکارهێنانی زمان لەرووی پراکتیکەوە وەک ئەوەی گوێ پێنەدات لێی

تێگەیشتووی یان نا. کاتێ بانگی دەکەی یان ناوی دێنی وەلام ناداتەوە. دەستپێشخەری ناکات بۆ دامەزراندنی گفتوگۆ. گفتوگۆی یەک لایەنە بە شێوەیەکی وەک هەرخۆی هەبێت و گوێ نەگرێت لە بەرامبەرەکەی. کەمیی مەیل و ئارەزوو وەک ئەوەی تاقەتی بەشداری نەبێت، گوێ نەدات و گوێ نەگرێت لە بەرامبەر یا یان ئارەزوو نەکات شت نیشانی خەڵک بدات یان شتیان بۆبهێنێ. کەمی سۆزو عاتیفە وەک وەلامنەدانەوەی زەردەخەنە بە زەردەخەنە، هاوبەشنەکردنی یاری و خۆشی و سەرسامی و وروووژان، وەڵامنەدانەوەی ستایش، خۆشی نەبینین لە مامەڵەی کۆمەڵایەتی و تێکەڵبوون، هاوخەمی نەکردن، ناموبالاتی و بێزاری لە سۆز و کۆنتاکتی جەستەیی. سنووورداریی پەیوەندیکردن بە خەلکەوە و پەیوەندیکردن تەنیا بۆ داوای یارمەتی، لاوازی لە لاسییکردنەوەی کۆمەلایتیدا بۆ نموونە ناتونێ بەشداریی یاریی سادە بکات لەگەل کەسانی تردا.

٢. هەندێک لە نیشانەکانی ئۆتیزم پەیوەندییان بە کەموکووریی زمانی قسەیی و زمانی ناقسەییەوە هەیە. بۆ نموونە خراپ بەکارنەهێنانی چاولەچاو روانین، نەزانین و تێنەگەیشتن و خراپ بەکارهێنانی زمانی جەستە وەک پشتکردنە خەڵک، ئیشارەتی دەست، تەوقە، ئیشارەتی

سەر و دەموچاو. نانۆرماڵیی قسەکردن و بەکارهێنانی زمان بەشێوەی سەیر وەک نەگونجاویی تۆن و خیرایی قسەکردن و و بەرزیی و نزمیی دەنگ و بڕی قسەکردن لەگەڵ سروشتی گفتوگۆکەدا. لاوازی و تێنەگەیشتن لە عەتف سۆزو گەرمی پەیوەندیی کۆمەلایەتی بۆ نموونە لاوازی بەکارهینانی هێمای دەموچاو، وشکی و بەکارنەهێنانی تەعبیری گەرم و شیرین بەرامبەر خەڵک، لاوازی نیشاندان و خستنەڕووی لایەنی عاتیفیی خۆی لە ڕووی چۆنێتی بەکارهێنانی زمان و زمانی جەستەو دەربڕینەوە. بە هەمان شێوە کەموکووڕی و کەمتوانایی بۆ تێگەیشتن و لێکدانەوەی دەربڕیبی ناقسەیی خەڵکی تر. لاوازی و کەمتوانایی بۆ یەکانگیرکردن و هاوئاهەنگکردنی دەربڕینی قسەیی و ناقسەیی بەشێوەیەک لەگەڵ یەکدا بگونجێن، وەک ئەوەی لەکاتی قسەکردندا سەیری چاو نەکەی یان ئیشارەت و دەربرێنی ناقسەیی نەگونجاو بەکاربێنێ لەگەڵ قسەکانتدا یان نەتوانێ ئەمانە پێکەوە بەکاربێنێ بەشێوەیەکی گونجاو.

٣. هەندێک لە نیشانەکانی ئۆتیزم پەیوەندییان بە کەموکووڕی کەسەکە هەیە لە دروستکردن و درێژەپێدانی پەیوەندی لەگەڵ خەڵک کە گونجاو بێت لەگەڵ قۆناغی پەرەسەندن و تەمەنییدا. بۆ نموونە ناتوانێت وەک منداڵی ئاسایی لەمنداڵی تر نزیك بێتەوە و

پەیوەندییان لەگەل ببەستێ یان دریژە بە پەیوەندییەکە بدات، یان ناتوانێ خۆی بخاتە جیی بەرامبەرەکەی تا لەچاوی ئەوەوە شتەکان ببینێ، تێبینی ئەوە ناکات ئەگەر کەسی بەرامبەری تاقەتی بابەتەکە یا چالاکییەکەی نەمابێت بۆیە ئەم هەر وەک خۆی لەئارادابێت بەردەوام ئەبێت، تێبینی ئێشارەت و زمانی جەستە و ئارەزووی بەرامبەرەکەی ناکات بۆ نموونە وەک ئەو حاڵەتەی بەرامبەرەکەی بێزار بێت و بیەوێت بابەتەکە بگۆریت. هەروەهاش تێنەگەیشتن و بێئاگایی لە دابونەریت و گونجان و نەگونجانی رەفتار، دەربڕینی نەگونجاوی عاتیفە وەک پێکەنین لەکاتی نەگونجاودا، ، پرسینی پرسیاری نەگونجاو یان وتنی شتی نەگونجاو لەرووی کۆمەلایەتییەوە. تێبینی بێزاری و بێمەیلی بەرامبەرەکەی ناکات، یاری لەگەڵ مندالی هاوتەمەن و هاوقۆناغی خۆیدا ناکات. ئارەزووی هاوڕییەتی هەیە بەس لە هاوڕییەتی تێناگات بۆنموونە زۆر سەختگیر و نیگەتیڤە و هەر فەرمان دەدات. وەلامدەیی گونجاوی نیە بۆ منداڵانی تر کە ئەیانەوێ پەیوەندی لەگەڵ ببەستن. بەگشتی ئارەزووی لە خەلکی تر نیە، کەنارەگیرو لووتبەرزەو لە جیهانی خۆیدایە، هەوڵ نادات سەرنجی کەسانی تر بەلای خۆیدا رابکێشێ، تیبینی منداڵ و کەسانی تر ناکات و تاقەتی لییان نیە و حەزی لێیە بەتەنیانی چالاک و سەرقاڵ بێت.

٤. هەندێک لە نیشانەکانی ئۆتیزم پەیوەندییان بە دووبارەکردنەوەو ستیرۆتایپی لە قسەکردن و جووڵەی لەش و بەکارهێنانی شتەکاندا هەیە. بۆنموونە لاساییکردنەوە و وتنەوەی قسە یان یەکسەر یان درەنگ وەک دووبارەکردنەوەی وشەو دەستەواژەو تەنانەت گۆرانی و گفتوگۆ. قسەکردن وەک گەورەو بە شیوەی فەرمی و بەکارهێنانی زاراوەی گەورەسالانە و تەکنیکی، وتنەوەی بولبولی و دەرخی، بەکارهێنانی وشەو دەستەواژە و رەمزی و وشەی نەزانراو کە خەڵکی تر لێی تێناگەن جگە لە بەخێوکەرو نزیکانی، بەهەڵە بەکارهێنانی راناو وەک بەکارهێنانی 'تۆ' لە جیاتی 'من'، بەکارهێنانی ناوی خۆی لەجیاتی 'من'، دەنگەدەنگی دووبارە وەک دەنگی نامەفهووم، هاوارو قیژە، نەجواکردنی بەردەوام. جووڵەی دووبارەی لەش وەک چەپڵەو و دەست جوولاندن و پەنجە جوولاندن، بەملاولادا جووڵان، باوەخولێ، جولاندنی دووبارەی دەست و پێ. رۆیشتن بەشێوەیەکی سەیر وەک لەسەر نووکی پەنجە، خۆرەقکردن، خۆ جیڕکردنەوەی نائاسایی، دانەکیڕەی نائاسایی، دەست لەسەر گوێ دانان، کارو رەفتارو یاریی دووبارە، پەنجە بە لووتاکردنی دووبارە. بەکارهێنانی دووبارەی شتەکان بەبێ سوود وەک بەردانەوی دووبارەی شتێک، ریزکردنی شتومەک و

یارییەکانی، دووبارە کردنەوەو داخستنی دەرگا یا داگیرساندن و کوژاندنەوەی گڵۆپ.

٥. کۆمەڵێکی تر نیشانە کە پەیوەندییان بە دووبارەکردنەوەی رەفتار و رێگری لە گۆڕانەوە هەیە. بۆنموونە منداڵەکە حەزی لە رۆتین و دووبارەکردنەوەی هەندێ کردەوەو رەفتاری سادەیە کە رەنگە هەندێکیان سەیرو سەمەرە بن، سوورە لەسەر پاراستنی ئەم رۆتینەو قبووڵی گۆرانکاری ناکات. رەنگە پەیڕەوی هەندێ نەریتی سەیر بکات وەک کەسیکی وەسواس وەک ئەوەی بەشێوەکەی شاز کارێک بکات و هەندێک جووڵەی دووبارەی بۆ بکات کە پێویست نەبێت. هەمان شت لەبواری قسەشدا راستە و رەنگە بەردەوام قسەیەک ، پرسیارێک یا بابەتێک دووبارە بکاتەوە یا بیەوێ بەرامبەرەکەشی بەوشیوەیە قسەبکات یان وەلام بداتەوە. بە شێوەیەکی ناماقووڵ رقی لە گۆڕانە و حەزناکا دۆخەکەی لێ بگۆڕیت بۆ نموونە لە چالاکیی رۆژانەدا یا تەنانەت لە شتی سادەدا وەک ئەوەی یەکێک لە شتەکانی بجووڵێنیت یان لە کاتی نان خواردندا شتێک لابەری یان زیاد کەی، شتێکی لێ بستێنی، یان رۆژێک بەرێگەیەکی تردا بیبەی بۆ قوتابخانە. ئەم سەختگیرییە بواری بیرکردنەوەش دەگرێتەوە بەو مانایەی کە لە قاڵبێکی زۆر تەسک و فەرمیدا بیردەکاتەوە، وشە بە وشە

لە قسە تێدەگات لە مانای ناراستەوخۆی قسە و گاڵتەو سوعبەت تێناگات.

٦. کۆمەڵێک نیشانەی تر پەیوەندیاین بە ئەڵوادابوون و حەزو ئارەزووی لەرادە بەدەروە هەیە بۆ هەندێک شت لە زۆر رووەو نۆرماڵ نیە. بۆ نموونە رەنگە تینی حەزەکە ناماقووڵ بێت یان شتەکە ئەوە نەهێنێت، یان ئارەزووی تەنیا لە یەک یان چەند شتێکی کەم و دیاریکراو بێت، فۆکەس بکات لە سەر هەندێ شتی کە هیچ گرنگی و مانایەکی تێدا نەبێت، بیەوێت شتەکان تەنیا بەدڵی خۆی بێت و هیچ کەموکووررییەکی تێدا نەبێت (پێرفێکت بیت ). هەروەها رەنگە ئارەزوو و خۆخەریککردنێکی سەیری هەبێت بۆ ژمارەو رەمز و ڕەنگ و هەندێ شێوە و وێنەو رووداو و شتی سادەی وەک پارچە یاری و پەت و لاستیک و شتی لە جۆرەوە. پەیواندیدار بەم نیشانانەوە، لەوانەیە ئەڵواداى هەندێ شت بێت و هەمیشە لەگەڵ خۆی بیگێڕێت یان رەنگە هەندێ ترسی نائاسایی هەبێت بۆ نموونە لە شتێک یان کەسێک کە بەجۆرێکی دیاریکراو خۆی گۆڕیوە یان شتیکی دیاریکراوی کردووە بەخۆیەوە.

٧. کۆمەڵێک نیشانەی تر پەیوەندییان بە چۆنێتیی وەلامدانەوەی ورووژێنە (هاندەرە) هەستییەکانەوە هەیە. لەم بوارەدا کەسی ئۆتیست لەوانەیە وادیاربێت کە زۆر

هەست بە ئازار ناکات یان گوێی پێنادات یان زۆر بەرگەی ئازار دەگرێت، ڕەنگە کەیفی بێت بە هەندێ شێوە و تێکسچەری دیاریکراو و دەستلێدانیان یان لەوانەیە لێیان بێزار بێت، ڕەنگە رقی لە قژبڕین و نینۆک کردن و ددان شتن بێت. لە ڕووی بینانییەوە کیشیەیەکی تایبەتییان نیە لە بینیندا بەڵام بەشیوەیەکی سەیر تەماشای شتەکان دەکەن وەک سەیرکردن لە زۆر نزیکەوە یان بە گۆشەی چاو یا بە گۆشەیەکی سەیر دەڕوانێتە شت کە ڕەنگە هەندێ جار وەک خێل دەربکەوێت. هەر لەم بوارەدا زۆر کەیفی بە سەیرکردن و خۆخەریککردن دێت بە جووڵەی شت و خولانەوەوە، وەک تەماشای پانکە و تایەی ئۆتۆمبیلی یاری و کردنەوە و داخستنی دەرگا و شتی لەوجۆرەوە. ئەم کاردانەوە نائاساییانە (ئارەزوو یا رق لێبوون) لە بزوێنەری هەستی ڕەنگە لە هەستەکانی تریشدا (بۆن، بیستن، بەرکەوتن، تام) خۆی بنوێت وەک ئەوەی زۆر بێزار و تووڕەیی بنوینێت بەرامبەر دەنگێکی ئاسایی یان تام و بۆنێک کە کەسانی تر بەلایانەوە ئاساییە. بە پێچەوانەشەوە لەوانەیە هەندێ کەسی ئۆتیست زۆر کەیفیان بێت بەم بزوێنەرە هەستییانە و زیاد لە نۆرماڵ خۆیانی پێوەخەریک بکەن وەک ئەوەی بەردەوام بۆن بە شتێکەوە بکات یان شتێک بلێسێتەوە یا دەستی پێدا بێنێ.

ئەو نیشانە و نموونانەی سەرەوە کە بە پێی دووا پێناسەی ئۆتیزم رێکخراون مەرج نیە هەموو لە یەک کەسدا هەبن یان هەبوونی یەکێکیان بەڵگەی ئۆتیزم بێت بەڵام هەبوونیان ئەبێتە مایەی گومانی نەخۆشییەکە و هەوڵدان بۆ دەستنیشانکردنی. بۆئەوەی کەسێک وە ک ئۆتیزم دەستنیشان بکرێت پێویستە نیشانەی هەبێت لە هەرسێ لایەنی یەک و دوو و سێ، و سەرەڕای ئەوەش بەلای کەمەوە نیشانەشی هەبێت لە دوو لایەن لە لایەناکانی چوار تا حەوت. واتە هەبوونی نیشانە لە یەک یا دوو لایان بەس نین بۆ دەستنیشانکردنی ئۆتیزم.

لەم دوا پێناسەیەدا، رادەی دژوارییی ئۆتیزم دابەشکراوە بۆ سێ ئاست، ئاستی یەک و دوو و سێ (وێنەی ٢). ڕادەی دژوارییی ئۆتیزم بەپێی دژوارییی ئەو نیشانانەیە کە لەسەرەوە ناوبران لە هەردوو چەمکی کەموکووڕی لە گەیاندنی کۆمەڵایەتی رەفتاری دووبارە و سنووردارکەردا.

| **ئاستی ١**<br>منداڵەکە ئەگەر پاڵپشت نەکرێ کەموکوڕییەکانی ئاشکران. ئەو کێشەی هەیە لە دەستپێکردنی گفتوگۆ وتێکەڵ بوون لەگەڵ کەسانی تردا یا وەلامدانەوەیان و لەوانەیە ئارەزووی تێکەلبوونی لەگەڵ خەڵکی تر نەبێت. لەڕووی رەفتاری دووبارەوە، ئەم رەفتارانە لە هەندێ دۆخی دیاریکراودا کارو فرمانی کەسەکە سنووردار دەکەن و ئەو بەرگری هەر هەوڵێک دەکات بۆ وەستاندنی ئەم رەفتارە دووبارانەی. |
|---|
| **ئاستی ٢**<br>منداڵەکە پێویستی بە پاڵپشتی بنەرەتی هەیە. تەنانەت لەگەڵ هەبوونی پاڵپشتیشدا کەموکوڕییەکانی ئاشکران. ئەو هەولی زۆرکەم ئەدات بۆ دەستپێکردنی گفتوگۆ لەگەڵ کەسانی تردا و وەلامدانەوەشی بۆ دەستپێشخەری کەسانی تر سنووردارە یان نەگونجاوە. لەڕووی رەفتاری دووبارەوە، ئەم رەفتارانە لە هەموو دۆخێکدا روودەدەن و ئەوەندە زۆرن بەئاشکرا هەستیان پێ دەکرێ، و ئەو بە سەختی بەرگری هەر هەوڵێک دەکات بۆ وەستاندنی ئەم رەفتارە دووبارانەی. |
| **ئاستی ٣**<br>منداڵەکە پێویستی بە پاڵپشتی ئێجگار زۆرە. ئەو توانستی پەیوەندیکردنی کۆمەلایەتی زۆر سنووردارە یا هەر نیەتی بە جۆرێک کە زەحمەتە بتوانێ هیچ دەسپیشخەرییەک بکات بۆ پەیوەندیکردن یا تێکەڵبوون لەگەڵ کەسانی تردا یا بەردەوامی بە و پەیوەندییە بدات. لەڕووی رەفتاری دووبارەوە، ئەم رەفتارانە لە هەموو دۆخێکدا روودەدەن وبە سەختی کارو فرمانی کەسەکە سنووردار دەکەن، و ئەگەر هەوڵی وەستاندنی بدرێت ئەو تووشی پەرێشانی دەبێت و بەزۆر هەوڵ ئەدا بگەڕێتەوە سەریان. |

**کورتەی ئاستەکانی دژواریی ئۆتیزم**

سەرچاوە: (دورانت،٢٠١٤) بە دە دەستکارییەوە

## دژواریی ئاستی ١

ئەو کەسەی بە ئاستی یەکی دژواری دادەنرێت نیشانەکانی کەمتر سەختن لە ئاستەکانی تر. نیشانەکانی ئاستی یەک لە بواری توانستی گەیاندن و پەیوەندیکردینی کۆمەلایەتی و نزیکبوونەوە لە خەڵک بوونیان هەیە و تێبینی دەکرێن بەڵام زۆر سەخت نین. واتە کەسەکە تارادەیەک توانای لە بوارانەدا هەیە بەڵام وەک پێویست نیە و رەنگە زۆر کەیفی بە تێکەڵبوون و پەیوەندیکردن نەیەت و نەتوانێ هاوڕێ بگرێت و هاورێیەتی بکات. بۆنموونە ئەم کەسانە رەنگە بتوانن گفتوگۆیەک لەگەڵ کەسێکی تردا دەست پێبکەن بەڵام نەتوانن وەکو پێویست درێژەی پێ بدەن و وەلام بدەنەوەو گفتوگۆکە وەک چاوەروان دەکرێ ئەنجام بدەن. لەڕووی رەفتاری دووبارە و ونەریتەوە (ئەنجامدانی کارێک بەشێوەی دووبارە بێ ئەوە مەبەستێکی دیاری هەبێت) ئەم کەسانەی ئاستی یەک لە هەندێ بارو دۆخدا بەشێوەیەکی ئاشکرا کێشەیان هەیە و ئەم رەفتارانەیان بەرچاوە و کاریگەری لەسەر ژیانیان دەکات. ئەم کەسانە رازی نابن کەسێکی تر هەوڵ بدات وەزعەکەیان لێ بگۆرێت، یا رۆتین و نەریت و رەفتارەکانیان پێ بگۆڕێت. هەربۆیەش ئەم کەسانە توانای خۆراهێنانیان لەگەڵ بارودۆخ و خەڵک کەمەو توانای خۆریکخستن و پلاندانانیان نیە. کەواتە

ئەمانە پێویستان بە پشتگیری هەیە و بە پشتگیری و چارەسەری پێویست دەتوانن کوالێتی ژیانێکی ماقوولیان هەبێت. چارەی پیویستی ئەمانە بە پلەی سەرەکی بریتین لە چارەسەری رەفتاری بەمەبەستی بەهێزکردنی کارامەیی گەیاندنی و پەیوەندیکردنی کۆمەلایەتی.

## دژواریی ئاستی ٢

ئەو کەسەی بە ئاستی دووی دژواری دادەنرێت نیشانەکانی سەختترن لە ئاستی یەک و لە هەردوو بواری پەیوەندکردینی کۆمەلایەتی و رەفتاری دووبارەدا کەموکوورری زۆریان هەیە بە جۆرێک کێشەی زۆریان لە ژیاندا بۆ دروست دەکات و ژیانیان سەخت دەکات. ئەمانە پێویستیان بە پشتگیرییەکی بنەرەتی هەیە بۆ ئەوەی بتوانن ژیان بەسەربەرن. ئەم کەسانە کەموکوورییەکی بەرچاویان هەیا لەبواری گەیاندنی قسەیی و ناقسەییدا، بە زەحمەت ئەگەر بتوانن پەیوەندی بکەن بە خەڵکەوە یان وەڵامی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی بدەنەوە و لەخەڵک نزیک ببنەوە یان بەشێوەیەکی گونجاو ئەم کارە بکەن. ئەمانە رستەی کورت سادە بەکاردێنن و زەحمەتە لە هێماو ئیشارەت و مانای ناراستەوخۆی قسە تێبگەن. لەڕووی رەفتاری دووبارەوە و نەریت و خۆخەریککردنەوە ئەم کەسانە بەردەوام کێشەیان هەیە و ئەم رەفتارانەیان زۆرە

و هەموو کەس هەستی پێدەکات. ئەم ڕەفتارانە وایان لێ دەکات نەتوانن لە زۆر بارودۆخدا بەباشی فرمان بکەن و ژیانی ڕۆژانە بە باشی بەسەر بەرن. کە خۆیان بە شتێکەوە خەریک دەکەن یا جەخت لە شتێک دەکەن ە زەحمەتە بتوانیت قایلیان کەیت واز بێنن یان ڕووبکەنە بابەتێکی تر. ئەگەر کەسێک هەوڵ بدات وەزعەکەیان لێ بگۆرێت، یا ڕۆتین و نەریت و ڕەفتارەکانیان پێ بگۆڕێت، ئەمانە بەئاشکرا دووچاری نارەحەتی و سترێس دەبن تووڕە دەبن. ئەمانە توانای خۆگونجاندن و ڕاهاتنیان لەگەڵ گۆڕان و بارودۆخی تازەی دەوروبەریانبدا زۆر سنووردارە. کەسی ئۆتیزمی ئاستی دوو پێویستیی بە پشتگیرییەکی زۆر هەیە و تەنانەت بەوەشەوە ڕەنگە نەتوانن خۆیان لەگەڵ گۆرانکاریی دەوروبەریاندا ڕابێنن. ئەم کەسانە پێویستیان بە زۆر جۆری پشتگیری هەیە لەبواری ڕەفتاری و زمان و کارامەیی ژیانی و پیشەیی و ڕاهاتن لەگەل دەنگ و بۆن و بزوێنەرەکانی تری دەوروبەردا.

## دژواریی ئاستی٣

ئاستی سێ دژوارترین ئاستی ئۆتیزمە. ئەو کەسەی لەم ئاستەدا دادەنرێت کەمووکووڕیی ئێجگار زۆری هەیە لە هەردوو بواری پەیوەندکردینی کۆمەلایەتی و ڕەفتاری

دووبارەدا. ئەمانە کەموکووڕیەکی ئیجگار زۆر و بەرچاویان هەیە لە توانای پەیوەندیکردنی قسەیی و ناقسەییدا کە زۆر سنوورداریان دەکات لەم ڕووەوە. زۆر زەحمەتە بتوانن پەیوەندیی کۆمەڵایەتی بکەن و هیچ ئارەزوویەکی ئەوتۆیان نیە بۆ لە خەڵک نزیک بوونەوە. وەلامدەییان بۆ پەیوەندی کۆمەڵایەتی و هەوڵی لێک نزیکبوونەوە یان ئێجگار کەم و دەگمەنە یان نانۆرماڵە.

لەڕووی رەفتاری دووبارە و ونەریت و خۆخەریککردنەوە ئەم کەسانە بەردەوام کێشەیان هەیە و ئەم رەفتارانەیان ئێجگار زۆر زاڵە و هەموو بوارەکان دەگرێتەوە وهەموو کەس هەستی پێدەکات. ئەم رەفتارانە لە هەموو ڕوویەکەوە کاریان لێ دەکات و وایان لێ دەکات نەتوانن بەباشی فرمان بکەن و ژیانی رۆژانە بە باشی بەسەر بەرن. کە خۆیان بە شتێکەوە خەریک دەکەن یا جەخت لە شتێک دەکەنەوە زۆر زەحمەتە بتوانیت قایلیان کەیت واز بێنن یان رووبکەنە بابەتێکی تر، ئەگەریش وازبێنن زۆر زوو دەگەڕێنەوە سەری. ئەگەر کەسێک هەوڵ بدات وەزعەکەیان لێ بگۆرێت، یا رۆتین و نەریت و رەفتارەکانیان پێ بگۆڕێت، ئەمانە بەئاشکرا دووچاری نارەحەتی و سترێسیکی زۆر دەبن تووڕە دەبن. ئەمانە توانای خۆگونجاندن و راهاتنیان لەگەڵ گۆڕان و بارودۆخی تازەی دەوروبەریاندا ئێجگار کەمە. کەسی

ئۆتیزمی ئاستی سێ پێویستیی بە پشتگیرییەکی زۆر بنەڕەتی هەیە و تەنانەت بەوەشەوە رەنگە نەتوانن خۆیان لەگەڵ گۆرانکاریی دەوروبەریاندا رابێنن. ئەم کەسانە پێویستیان بە چارەسەری چڕوپڕ و بەردەوام هەیە لە زۆر بواری وەک رەفتاری و زمان و کارامەییە بنەرەتییەکانی ژیاندا تا بتوانن ڕادەیەک سەربەخۆیی بەدەست بێنن.

هەروەک چۆن دەستنیشانکردنی ئۆتیزم کارێکی ئاسان نیە، بەهەمان شێوە دیاریکردنی ئاستی دژواریی بۆ ئەو سێ ئاستەی سەرەوە کارێکی سەختە و سنوورەکان ڕوون و ئاشکرا نین. هیچ پشکنینێکی تاقیگە و شتی لەوجۆرە نیە بۆ دیاریکردنی ئاستی دژواری. وەک لە نێشانەکانەوە دیارە ئاستەکان بەردەوامییەکن لەپانتایی نیشانەکانی ئۆتیزم و دیاریکردنی ئاست لەلایەن لیژنەو پسپۆڕی تایبەتەوە پاش چەندین دانیشتن لەگەڵ منداڵ و کەسوکار و چاودێریکردن و لێکۆڵینەوەی منداڵ ئەنجام دەدرێ.

٣

## دەستنیشانکردنی ئۆتیزم

دەستنیشانکردنی ئۆتیزم پرۆسەیەکی دوورودرێژە و هاوریێە لەگەڵ مەراق و ماندووبوونێکی زۆر بۆ خێزان تەنانەت لە وڵاتە پێشکەتووکانیشدا. هۆکاری ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئاڵۆزیی نەخۆشییەکە، رادە و دژوارییی نیشانەکانی، نەبوونی پشکنینێکی تاقیگەیی دیاریکراو بۆ دەستنیشانکردن، زۆریی حاڵەتەکان وە هەروەها کەمیی کەسانی پسپۆڕ و تیمی پسپۆڕ. دەستنیشانکردن بە یەک دانیشتن ناکریت بەڵکوو پێویستی بە سەردانی دووبارەو چاودێریی زۆر هەیە تا پزیشک یان پسپۆر و تیمی پسپۆڕی تایبەت دوا بڕیار بدەن. زۆربەی کات گومانی نەخۆشییەکە لەلایەن کەس و کار و ناسیاو و مامۆستا و پزیشک و ئەوکەسانەوە سەرهەڵدەدات کە لەگەڵ منداڵەکە دەژین یا کاردەکەن. ئەم گومانانە زیاتر لە ساڵی دووەمی تەمەنەوە سەرهەڵدەدەن کە وادەبینرێت منداڵەکە وەک هاوتەمەنەکانی نیە لەڕووی رەفتار و قسەکردن و فێربوون و یاریکردن و سەرنجدانەوە. ئەکادیمیای منداڵپزیشکانی ئەمەریکا پێشنیار دەکات هەموو منداڵان بە شێوەیەکی رۆتینی لە تەمەنی ١٨ مانگی و ٢٤ مانگیدا سکرینینی تایبەت بە ئۆتیزمیان بۆ بکرێت. هەندێک لە

نیشانە سەرەتاییەکانی ئۆتیزم لەوانەیە ئەمانە بن (سی دی سی، ٢٠٢٠):

- خۆلادان لە لە چاو روانین
- بێ مەیلی و گرنگی نەدان بە منداڵی تر و بە بەخێوکەر
- لاوازی و دواکەوتنی زمان وەک ئەوەی وشەی کەمتر بزانێت یا بەکاربهێنێ لە هاوتەمەنەکانی
- نارەحەتی و توورەبوون لە گۆڕانکاریی کەم لە رۆتینی رۆژانەدا.

خشتەی ١ لە خوارەوە (ئەناگنۆستو،٢١٠٤) گرنگترین ئەو ئاڵا سوورانە نیشان دەدات کە ئەبێ گومانی ئۆتیزممان لا دروست بکەن.

**ئاڵا سوورەکانی ئۆتیزم لە منداڵی تەمەن ١٢-١٨ مانگدا**

**١- پەیوەندی کردنی کۆمەڵایەتی**

- ✓ کەمیی یا نانۆرماڵیی رووانین وسەرنجدان
- ✓ کەمیی یا نانۆرماڵیی هاوبەشکردنی سۆزداری(عەتفی پۆزەتیڤی کەمتر و هی نێگەتیڤی زیاتر)
- ✓ کەمیی یا نانۆرماڵیی زەردەخەنەی کۆمەڵایەتی یان بەرامبەر
- ✓ کەمیی ئارەزووی کۆمەڵایەتی و کەیفکردن لەگەڵ کەسانی تر
- ✓ کەمیی ئاوڕدانەوە و گوێپێدان. وەلام نەدانەوە/ئاوڕنەدانەوە ئەگەر بە ناو بانگ بکرێت
- ✓ کەمیی هاوئاهەنگی شێوازەکانی گەیاندن بۆ نموونە روانین و تەعبیری دەموچاو و شێوەی دەنگ و ئیشارەت
- ✓ بەرەودواچوون و لەدەستدانی هەوبەستەیی کۆمەڵایەتی-عاتیفی

**٢- زمان**

- ✓ دواکەوتن یا نانۆرماڵیی گڕوگاڵ و لاساییکردنەوەی قسە و دەنگ
- ✓ کەمیی تێگەیشتنی زمان و زمان فێربوون بۆ نموونە درەنگ فێربوونی وشە وەک ئەوەی لە ١٦ مانگیدا یەک وشە نەزانێت. فێربوونی وشەی شاز وەک سەرەتا یا دووبارەکردنەوە بەشێوەیەکی نائاسایی
- ✓ تۆنی نائاسایی دەنگ و دەنگی گریان
- ✓ دواکەوتن یا نانۆرماڵیی ئێشارەت و دەست راوەشاندن (بایبای) و زمانی جەستە بە گشتی. بۆ نموونە لە ١٢ مانگیدا دەست راوەشاندنی بای بای نەزانێت.
- ✓ بەرەودواچوون و لەدەستدانی توانستەکانی گەیاندن و زمان

**٣- یاری**

- ✓ کەمیی یا نانۆرماڵیی کاری لاساییکردنەوەی خەڵک
- ✓ کەمیی یا نانۆرماڵیی یاری بە بیر و بەکار) واتە بیری تێدا بەکاربێنێ و وەک پێویستە کاری تێدا بکات)
- ✓ دەستکاریکردن و بەکارهێنانی زیاد لەپیویست و نائاسایی شتی یاری و شتومەکی تر، یا زیاد لە پێویست تێڕوانینیان
- ✓ خۆخەریککردن و کاری دوبارەو زیاد لەپێویست لەگەڵ شتی یاری و شتومەکی تر

**٤-بینایی و هەست و جووڵە**

- ✓ تێڕووانینی زیاد لە پێوست و نائاسایی و چەقبەستنی بینایی واتە بەردەوام بروانێتە شتێک وەک گڵۆپ
- ✓ وەلامدەیی و کاردانەوەی نائاسایی (کەمتر یا زیاتر لە ئاسایی) بۆ هەندی دەنگ و هاندەری هەستی
- ✓ دواکەوتنی توانستی جوڵەیی ورد (وەک جووڵەی پەنجەکان) یا درشت (وەک راوەستان و رێکردن) ، کەمیی تۆنی ماسولکە
- ✓ ئەنجامدانی رەفتاری جووڵەیی (مۆتۆڕی) دووبارەیی، دانانی لاق یا پەنجەکان بەشێوەیەکی نانۆرماڵ

دەستنیشانکردنی ئۆتیزم پرۆسەیەکی ئاڵۆزە و لە ولاتانی جیاواز بەشێوەی جیاواز روودەدات. بەڵام لەبەرئەوەی لە وڵاتە پێشکەووەکاندا کێشەی ئۆتیزم لە بایەخی تەندروستیی گشتیدا جێگەی خۆی گرتووە و گرنگیی پێدەدرێ، دەستنیشانکردن بە سیستەمێکی

دیاریکراودا دەروات و لە لایەن پسپۆری تایبەت یان لیژنەیەکی پسپۆڕەوە بڕیاردەدرێت. هۆی ئەمەش جگە لە زەحمەتیی دەستنیشانکردنەکە خۆی، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەش کە ئۆتیزم کێشیەکی درێژخایەنە و پێویستی بە چارەسەر و بایەخی بەردەوام هەیە بە درێژایی تەمەن بۆیە پێویستە پرۆسەی دەستنیشانکردنی ورد بێ و کاتی پیوستی پیبدرێت بۆ دڵنیابوون. بۆ نموونە لە کەنەدا هەنگاوی یەکەمی دەستنیشانکردن لە پزیشکی خێزان یان بنکەی تەندرویستییەوە دەست پێدەکات پاش تێبینیکردنی ئەو ئاڵا سوورانەی سەرەوە لەلایەن کەسوکار و مامۆستا و کەسانی ترەوە.

هەلسەنگاندنی ئۆتیزم پرۆسەیەکی گشتگیرە و لایەنی کۆمەلایەتی و رەفتاری و دەروونی و کلینیکی و بایۆلۆژی و بۆماوەیی و پشکنینی تاقیگەیی و رادیۆلۆژی و هی تریش دەگرێتەوە. هەڵسەنگاندنی یەکەم لەلایەن پزیشکی خێزان یان بنکەی تەندروستییەوە ئەنجام دەدرێت. لەم هەڵسەنگاندنە سەرەتاییەدا پێویستە پشکنین بۆ منداڵەکە بکرێت، چاودێری بکرێت، گوێ لە دایک و باوک بگێرێت، تێبینی کەسانی تر وەکوو مامۆستای دایەنگە و باخچە و خوێندنگا لەبەرچاو بگێرێ و بە دوورودرێژی فۆرمی نیشانەکانی ئۆتیزم پڕبکرێتەوە. لەپاش ئەم هەڵسەنگاندنە چڕوپڕە پزیشک دەتوانێ

بریاری خۆی بدات کە ئاخۆ پێویست دەکات منداڵەکە رەوانە بکات بۆ قۆناغی داهاتووی دەستنیشانکردن لەلایەن پسپۆڕانی ئۆتیزمەوە، یاخود پێویست ناکات و منداڵەکە پێویست بە هیچ نیە یا پێویستی بە چاودێری زیاتر هەیە.

دەستنیشانکردنی کۆتایی ئۆتیزم لەلایەن پزیشکی پسپۆڕی منداڵانی شارەزا لە ئۆتیزم یان دەروونپزیشکی منداڵان یان تیمی پسپۆر لە دەرونزانی کلینیکی لەگەشەی منداڵەوە ئەنجام دەدرێت. بڕیاردانی نەخۆشییەکە و راگەیاندنی ئەو هەواڵە بە باوانی منداڵ کارێکی زۆر دژوارە بۆیە وردەکارییەکی زۆری دەوێت، کاتی زۆری دەوێت کە رەنگە چەند دانیشتنێک بخایەنێت، یان پێویسی بە پشکنینی بوارە جیاوازەکانی گەشەهەبێت وەک زمان و رەفتار و لایەنی مەعریفی، زۆربەی کاتیش پێویستی بە پشکنینی تاقیگەیی دەبێت.

وا خەمڵێنراوە کە رێژەیەکی بەرچاوی ئەو کەسانەی کە ئۆتیزمیان هەیە کێشەی پزیشکی تریشیان هەبێت وەک ئەقڵی و دەروونی و بۆماوەیی و دەماری (بڕوانە بەشەکانی دواتر). بۆیە دەستنیشانکردنی ئۆتیزم پێویستی بە هەڵسەنگاندنێکی تەواو هەیە بۆ دیاریکردنی نیشانەکای ئۆتیزم و دەستنیشانکردنی هەر نەخۆشی و کێشەیەکی تر

که ڕەنگە هاوڕێ بێت لەگەڵ ئۆتیزم. هەڵسەنگاندن پێویستە ئەم پشکنینانە بگرێتەوە: وەرگرتنی بەسەرهاتی تەواو، پشکنینی فیزیکیی تەواو، پشکنینی بۆماوەیی، پشکنینی میتابۆلیکی، پشکنینی دەماری (ماکدۆگڵ، ٢٠١٦). لە خوارەووە بە کورتی باسی ئەم پشکنینانە دەکەین وەک لە سەرچاوەی سەرەو باس کراوە.

**١. بەسەرهاتی نەخۆشی**

دەستنیشانکردنی ئۆتیزم پێویستی بە وەرگرتنی بەسەرهاتێکی ورد و وریایانەی کێشەکە هەیە کە هەردوو بواری منداڵ و خێزان بگرێتەوە. یەکێک لە گرنگرتین لایانەکانی بەسەرهات، بەسەرهاتی پەرەسەندن و گەشەی منداڵە واتە پرسیارکردن و تێگەیشتن لە چۆنێتی پەرەسەندن و پێگەیشتنی منداڵ لە سەرەتای ژیانیەوە چونکە هەندێک لە نیشانەکان لە ساڵی یەکەمەوە ڕەنگە جێگەی سەرنج بن. هەڵسەنگاندنی لایەنی پەرەسەندنی منداڵ ڕەنگە بەڵگەی یەکەم بێت بۆ دەستنیشانکردنی ئۆتیزم. پەرەسەندن مەبەست لە گەشەی جەستەیی نیە بەڵکوو هەموو لایانەکانی پێگەیشتن و فامکردنەوی منداڵ دەگرێتەوە وەک نۆرماڵ لە منداڵانی ئاساییدا ڕوودەدات کە ئەم لایەنانە دەگریتەوە: گەیاندن و پەیوەندی کردن، مەعریفی (فامکردنەوە)، یاری و سەرقاڵی، جووڵە،

هەست، ڕەفتاری و عاتیفی، کۆمەلایەتی، خوێندن و پەروەردەیی، نەخۆشیی تر. پرسیارکردن دەربارەی هەریەکە لەو لایەنانی سەرەوە پێویستە هەموو تەمەنی منداڵ بگرێتەوە و بە وردی و بە نموونەوە یاداشت بکرێت و ڕادەی دژوارییی و دووبارەبوونەوە و باش و خراپتربوونی لەبەرچاو بگیرێت.

بواری گەیاندن و پەیوەندیکردن توانای منداڵ دەگرێتەوە بۆ ناردن و تێگەیشتن و ئاڵوگۆڕی زانیاری بە شێواز و ڕێگەی جۆراوجۆر وەک زمان و زمانی جەستە و ئاماژە. کۆرپە وردەوردە فێری ڕوانین و شنەشن و دەربڕینی دەموچاو دەبێت وەک وەلامدانەوە بۆدایک، پاشان لە تەمەنی شەش مانگی تا یەک ساڵی فیری هەندێ وشە دەبێت و لە دوای یەک ساڵییەوە فێری سەرنج ڕاکێشان و لەچاو ڕوانین و ڕستەی دوو وشەیی دەبێت و لە سێ ساڵیشدا زۆربەی منداڵان دەتوانن بە ڕستەی کورت قسە بکەن. دواکەوتنی زمان لە منداڵی ئۆتیزمدا جۆراوجۆرە؛ هەندێکیان ڕەنگە بەتەواوی ناقسەیی بن (فێری قسە نەبن)، هەندێکی تریان لەوانەیە تەوا فێر ببن، بەڵام دواکەوتنی قۆناغەکانی فیربوونی زمان بەگشتی لە ساڵی دووەمی تەمەندا ڕەنگە لە منداڵی ئۆتیزمدا بەدی بکرێت.

له چوار منداڵ یەک تا دووانیشیان لەوانەیە لە دەوروبەری دوو ساڵیدا تووشی دانەدواوەی زمان بن واتە ئەو وشە و دەربڕینانەیان بیردەچێتەوە کە پێشتر فێری بوون. ئەو مندالانەی کە بەتەواوی فێری زمان دەبن، کە گەورەتربوون ڕەنگە لە هەندێ لایەنی زمان تێنەگەن وەک مانای ناراستەوخۆی وشەو قسە (مانای ژێرەوە) و سوعبەت و ئاماژە. هەڵسەنگاندنی لایەنی گەیاندنی و زمانی منداڵ پێویستی بە پسپۆری بواری قسە و زمان هەیە (چارەسازی زمان).ئۆتیزم دەشێ هاوڕێ بێت لەگەڵ مەودای جیاوازی بواری فام و مەعریفیدا هەر لە زیرەکیی سەروو ئاساییەوە تا دواکەوتنی فام.

هەموو منداڵیکی ئۆتیزم پێویستە لە ساڵانی سەرەتای خوێندنگا بەدواوە بەردەوام هەلسەنگاندنی بواری مەعریفییان بۆ بکرێت بۆ دەستنیشانکردنی ڕێژەی زیرەکی و هەر دواکەوتنێک لە بواری فێربووندا و دیاریکردنی پێداویستییەکانی منداڵ لەو بوارەدا. وا خەمڵێنراوە کە ٣١% ی مندالانی ئۆتیزم کەمتوانایی فێربوونیان هەیە (پلەی زیرەکی ٧٠% و بەرەوخوار)، ٢٣% لەسەر لێوارن (٧١-٨٥%) وە ٤٦% یشیان ئاسایی یان سەروو ئاسایین (ماکدۆگڵ،٢٠١٦). سەرچاوەیەکی تر ڕێژەی ئەوانەی کەمتوانایی فێربوونیان هەیە بە ٣٨% دەخەمڵێنێت (دورانت،٢٠١٤). تا پلەی

زیرەکی زیاتر بێت پێویستی منداڵ یا کەسی ئۆتیزم بە پاڵپشتی خێزان وبایەخی پیشەیی کەمتردەبێتەووە.

لەڕووی پەرەسەندنی جووڵەییەوە (مۆتۆری) زۆربەی منداڵانی ئۆتیست کێشەیەکی ئۆتۆیان نیە و قۆناغەکان بە ئاسایی دەبڕن. هەندێ ستیرۆتایپی جووڵەیی (شێوازی دووبارەی جووڵە) وەک باڵ راوەشاندن و لەسەرنووکی پێ رۆیشتن و ئەنجامدانی هەندێ نەریتی جووڵەیی دووبارە وەک خولانەوە یان تیپەڕین بە دەرگادا لە ئۆتیزمدا زۆر دەبینرێن. رەنگە هەندێ باوان منداڵەکەیان بە سست و بێهێز باس بکەن لەبەرئەوەی وا دەردەکەون بەڵام بۆ دڵنیابوون لەوەی تینی ماسووکەیان ئاساییە پێویستە لەکاتی تووڕەبوونیشدا سەرنج بدرێن.

هەڵسەنگاندنی ئۆتیزم پێویستی بە پرسیارە دەربارەی پرۆسەی هەستی چونکە ئام منداڵانە جیاوازن لە منداڵی 'ئاسایی' لە رووی کاردانەوەیانەوە بۆ بزوێنەرە هەستییەکان؛ ئەمانە هەندێ جار زۆر بێموبالاتن و گوێ نادەن بە بزوینەری هەستی هەندێ جاریش کاردانەوەی توندیان هەیە. لەوانەیە دایک تێبینی ئەوەی کردبێت کە منداڵەکەی تێبینی دەنگ و هاتوچۆی دەروبەری ناکات، یان بەشیوەیەکی نائاسایی بەرگەی ئازار دەگرێت، یان رەنگە وەک بێتەحەممول و 'کشمیشی' باسی بکات لە

بەرامبەر بیستن یا بینینی هەندێ دەنگ و ڕەنگ و جلوبەرگ و خواردندا. جگە لەمانە منداڵ لەوانەیە زیاد لە ئاسایی شت بەرێت بۆ دەمی یان شت بلێسێتەوە یان یان شت بخاتە دەمیەوە کە رەنگە مەترسیشی بۆ دروست بکات.

وەرگرتنی بەسەرهات پێویستە لایەنی رەفتاری و یاری و سەرگەرمیش بگرێتەوە چونکە منداڵی ئۆتیست کەموموڕیی هەیە لەم ڕووانەوە. رەفتاری دووبارە و دوورەپەرێزی و کەموکووڕی لە ئارەزووی تێکەڵ بوون و وەڵامدانەوەی کۆمەڵایەتی باون. یان رەنگە دایک باسی وڕکنی و تووڕەبوون و رەفتاری پەلاماردەرانە و زەحمەتیی رازیکردنی منداڵەکەی بکات. لە ڕووی یاری و سەرگەرمییەوە، منداڵی ئۆتیست رەنگە وەک هاوتەمەنەکانی خۆی مەیلی یاری نەبێت یان توانست و شارەزایی لە یارییەکاندا وەک ئەوان پەرەنەسەنێت و گۆڕانکاریی بەسەردا نەیەت. پێویستە پرسیار بکرێت لەمەڕ چۆنێتی یاریکردن و مامەڵە کردنی منداڵەکە لەگەڵ هاوڕیکانی، بۆ نموونە ئەوەی ئاخۆ منداڵەکە خوو بەهەندێ یارییەوە دەگرێت و زیاد لە ئاسایی بە شتێک، بە یارییەک یا بە شێکی یارییەکەوە خۆی سەرقاڵ دەکات یان بەشێوەیەکی بەردەوام هەمان شت دووبارەدەکاتەوە، یان رۆڵ و سەرەی منداڵانی تر لەبەرچاو دەگرێت.

جگە لەمانە گرنگە لەکات هەڵسەنگاندندا پرسیاری بەسەرهاتی نەخۆشییەکانی تری منداڵەکە بکرێت چونکە رەنگە جارجار نیشانەی تریان هەبێت یا هەبووبێت وەک سک ئێشە و قەبزی و کەمخەوی و خەبەربوونەوە و گەشکە و شتی تر. گرنگە پرسیاری تەواو لە هەموو لایەنەکانی تەندروستیی مندالەکە بکرێت هەر لە لەدایکبوونەوە تا کاتی ئێستا. لە مندالیّ گەورەتردا، پرسیارکردن سەبارەت بە بەسەرهاتی فێربوونی منداڵ لە ماڵەوە و باخچەی ساوایان و خوێندنگا پێویستە بۆ تێگەیشتن لە توانا و بارودۆخی منداڵەکە و پێداویستییەکانی.

## ٢. پشکنینی فیزیکی

ئەم منداڵەی گومانی ئۆتیزمی لێ دەکرێت رەنگە چەندین جار رێی بکەوێتە لای پزیشک چ بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی نیشانەکانی ئۆتیزم چ بۆ کێشەی تەندروستیی ترکە رەنگە هەندێکیان هاوڕێ بن لەگەڵ ئۆتیزم. پشکنینی فیزیکیی منداڵ گرنگترین هەنگاوە دوای گوێگرتن لەبەسەرهاتی نەخۆش چ بۆ دڵنیا بوون لە گەشە و پەرەسەندنی نۆرماڵی منداڵەکە چ بۆ دیاریکردنی هەر نیشانەیەک. پێویستە لە هەموو سەردانێکدا کێشی منداڵ و پێوانەی باڵا و چێوەی سەر و پەستانی خوین و رێژەی

لێدانی دڵ ئەندازەگیری بکرێن چونکە نانۆرماڵیی ئەمانە دەشێ ئاماژە بن بۆ هەندێ کێشەی گەشە و نەخۆشی و نارەحەتیی تر کە لەوانەیە پێویستیان بە کاری زیاتر هەبێت.

هەرجۆرە شێواوی و کەموکورتییەکەی جەستەیی دەبێ تێبینی بکرێ چونکە لەوانەیە نیشانەی هەندێ کێشەی زکماکی بن. بەهەمان شێوە بچووکی یا گەورەیی سەر رەنگە نیشانەی هەندێ نەخۆشیی دەماریی یا زکماکی بن. پشکنینی چاو لەڕووی بینایی و روانینەوە گرنگە بۆ ئاگاداربوون لە هەر کێشەیەکی توانای بینین و ماسولکەکانی چاو. پشکنینی گوێچکە و دەم و ددان گرنگە بۆ دەستنیشانکردنی هەوکردن و هە کێشەیەکی تر کە رەنگە بەخێوکەر هەستی پێ نەکردبێ بۆ نموونە لەبەرئەوەی منداڵەکە زیاد لە ئاسایی بەرگەی ئازار دەگرێت و دەری نەخستووە. تێبینی کردنی رەفتاری منداڵ گرنگە بۆ نیشانەکانی ئۆتیزم کە پێشتر باسکران.

لەڕووی ماسولکە و دەمارییەوە پشکنینی تۆنی ماسوولکە گرنگە چونکە زۆریان تۆنیان لاوازە. پشکنینی مەودای پاژنەی پێ گرنگە لەبەرئەوەی ئەم منداڵانە زۆر لەسەر نووکی پەنجە دەڕۆن و رەنگە بەوهۆیەوە ژێی پاژنەی پێیان کرژبووبێ و پاژنەیان جووڵەی

کەمبووبێتەوە. هەندێ منداڵ تیک (لەرزینی هەندێ ماسوولکەی ورد) یان هەیە وەک چاوتروکاندندن کە پێویستە تێبینی بکرێت.

## ٣. پشکنینی تاقیگەیی و بۆماوەیی

واخەملێنراوە کە ١٠-٢٠% ی ئەوکەسانەی ئۆتیزمیان هەیە کێشەیەکی بۆماوەییان هەبێت کە ئەمەش زیاتر لە سەد حاڵەتی پەیوەندیدار بە جینەکان و جینۆمەوە دەگرێتەوە کە بەجۆرێک لەجۆرەکان هاوڕێن لەگەڵ ئۆتیزم (ماکدۆگل،٢٠١٦). کۆمەڵەی پزیشکانی منداڵی ئەمەریکا رێنمایی وایە کە هەموو منداڵێکی ئۆتیزم پشکنینی جینۆمیی بۆ بکرێت بە تێستی مایکرۆئارەی کرۆمۆسۆمی (Chromosomal Microarray) بە مەبەستی دەستنیشانکردنی هەرکێشەیەکی بۆماوەیی چونکە ئەم پشکنینە زۆر وردترە و توانایەکی باشتری هەیە بۆ دۆزینەوەی کێشەی کرۆمۆسۆمەکان. جگە لەوەش وەڵامی باشتری هەندێ پرسیارو مەراقی خێزانەکان دەداتەوە سەبەرات بە بوون و نەبوونی کێشە بۆماوەییەکان.

جگە لە مایکرۆئارەی کرۆمۆسۆمی، پێویستە تێستی تاقیگەیی بکرێت بۆ دۆزینەوەی کۆنیشانەی ئێکسی ناسک

(Fragile X Syndrome) کە حاڵەتێکی بۆماوەییە پەیوەندی بە کرۆمۆسۆمی ئێکسەوە هەیە، بەتایبەتی لەومنداڵانەدا کە کەمتوانایی فێربوونیان هەیە یان سەریان گەورەیە یان خێزانەکانیان بەسەرهاتی نەخۆشی بۆماوەییان هەیە کە پەیوەندی بە کرۆمۆسۆمی ئێکسەوە هەیە. هەرچەندە بازدان لە جینەکانی PTEN و MECP2 لە منداڵی ئۆتیزمدا دەگمەنە بەڵام لەبەر گرنگی دەستنیشانکردنی ئەم حاڵەتە بۆ بەدواداچوونی دواتری نەخۆش لە ڕووی هەندێ لووەوە، پێویستە پشکنینی بۆماوەیی بۆئەم مەبەستە بکرێت. پشکنین بۆ دەستنیشانکردنی بازدانی جینی بەتایبەتی لەو منداڵە کچانەدا پێویستە کە کەمتوانایی ژیرییان هەیە یا لە گەشە و پەرەسەندندا دووچاری دانەدواوە دەبن (ئەناگنۆستو، ٢٠١٤).

ڕەنگە بە پێی ئەنجامەکانی پشکنینی کلینیکی و بەسەرهاتی نەخۆش تێست و پشکنینی تریش پێویست بن. بۆ نموونە ئەو مناڵانەی کێشەی تریان هەیە وەک فێ و کێشەی سیمایی بەرچاوی وەک بچووکسەری ڕەنگە پێویست بکا پشکنینی وێنەگرتنی سەر و کارۆگرافی مێشک (هێڵکاریی مێشک) و تێستی تریان بۆ بکرێت. ئەم تێستانە لە منداڵدا ئاسان نین چونکە ڕەنگە پیویست بکا بەنجی گشتی بکرێن. خشتەی ژمارە ٢ لیستی ئەو هەلسەنگاندن و پشکنینانە نیشان دەدات کە لە ئۆتیزمدا

ڕەنگە پێویست بکا ئەنجام بدرین بەپێی حاڵەتی نەخۆشەکە (ئەناگنۆستو، ٢٠١٤).

| **پشکنین و تێستی پێویست بۆ منداڵانی گومان لێکراو بە ئۆتیزم (سەرچاوە: ئەناگنۆستو، ٢٠١٤)** | | |
|---|---|---|
| **بابەتی پشکنین** | **کەی پێویست دەکات** | **ناو و جۆری تێست** |
| پشکنینی بۆماوەیی | هەموو کەسێکی ئۆتیزم | مایکرۆئارەی کرۆمۆسۆمی (جینۆم)<br>کۆنیشانەی ئێکسی ناسک (جینی FMR) |
| | خەمی هەبوونی نەخۆشیی تر | تێست بۆ تیوبەرۆس سکلیرۆسیس و هەر نەخۆشییەکی تر |
| | نەخۆشی مێیینە کەمتوانایی فێبوونی هەبێت | جینی MECP2 بۆ کۆنیشانەی رێت |
| وێنەگرتنی مێشک و دەمار | ئۆتیزمی ئاڵۆز: هەبوونی نیشانەی کلینیکی تایبەت، دیسمۆرفۆلۆجی، بچوکسەری، گەورەسەری نائاسایی، کێشەی پێست، فێ، نانۆرماڵیی کارۆگرافیی مێشک ، دانەدواوەی جووڵەیی | وێنەگرتنی موگناتیسیی (ئێم ئارئای) مێشک سپێکترۆسکۆپی |
| پشکنینی میتابۆلیزمی | بەپێی پشکنینی کلینیکی بۆ نموونە هەبوونی کەمتوانایی دژواری فێربوون، فێ، دانەدواوەی گەشە و پەرەسەندنن | گازەکانی خوێن ئەمۆنیا، لاکتەیت، پایرۆڤەیت، ترشی یوریک، ترشی ئەمینی ئەسیتایل کۆلین (گشت و ئازاد) ساکەراید و ترشەئۆرگانییەکانی میز |
| پشکنینی گشتی | ئەگەر دواکەوتنی گەشەو پەرەسەندن هەبێت | T4, TSH |

| | | |
|---|---|---|
| | | تێستی گشتیی خوێن<br>ئاستی فێڕیتین |
| | خەمی بەرزیی ڕێژەی قورقوشم لە ناوچەکەدا پێسخۆریی منداڵ | قورقوشمی خوێن |
| | ئەگەر چارەسەری دەماری پێویست بێت | چەوریی خوێن<br>شەکری خوێن , HbA1c<br>کارۆگرافیی دڵ |
| کۆئەندامی هەرس | سکئێشە پاش خواردن، بێداربوونەوە لە شەودا | پشکنین بۆ سووتانەوەی سوورێنچک بەهۆی گەڕانەوەی خواردنەوە |
| | بەرزیی ژمارەی ئیۆزینۆفیلی خوێن | پشکنین بۆ سووتانەوەی سوورێنچک |
| | باکردنی سک هەفتەی ٢-٣ جار | ئاستی ترانسگلوتامینەیزی شانەکان بۆ نەخۆشیی سیلیاک |
| | کەمخۆراکی و کەمکردنی کێش | ئاستی پرۆتینی خوێن، ئەلبومین، کالیسیۆم، ڤیتامین دی |
| دەمارزانی | فێ و دانەدواوەی گەشەو فێربوون | کارۆگرافیی مێشک (لەخەودا) |
| دەرونزانی و دەروونپزیشکی | خەمی کێشەی عەقڵی | هەڵسەنگاندن بۆ نەخۆشییاکانی تر |
| | دیاریکردنی تەمەنی عەقڵی | هەڵسەنگاندنی ئاستی مەعریفی و گونجانی ڕەفتاری |
| | خەمی فێربوون | هەڵسەنگاندنی مەعریفی و ئاکادیمی و یاد و توانستی فرمانی ڕاپەڕێنەری |
| بواری قسە و زمان | خەمی فێربوونی قسەو زمان | هەلسەنگاندنی قسەو زمان |
| باری پێشەیی و چارەسەری سروشتی | خەمی هەبوونی کێشەی هەستی و جووڵەیی | هەڵسەنگاندنی هەستی و جوولەیی |
| ڕەفتاردەرمانی | خەمی کێشەی ڕەفتاری | هەڵسەنگادنی ڕەفتاری |

لەگەڵ هەموو ئەو پشکنین و تێستانەدا کە لەوانەیە کەسی تووشبوو بە ئۆتیزم پێویستی بێ بۆ دیاریکردنی ئاست و رادەی دژواریی نەخۆشییەکە و نیشانەکانی، وە هەروەها بۆ دەستنیشانکردنی هەرکێشەیەکی تری هاوڕی لەگەڵ ئۆتیزم، دەستنیشانکردنی ئۆتیزم خۆی بەشێوەیەکی سەرەکی پشت دەبەستێ بە هەڵسەنگاندنی پەرەسەندن و رەفتاری منداڵەکە لەبەر رۆشنایی مەرجەکانی DSM-V بۆ کێشەی پانتایی ئۆتیزم کە پێشتر باس کران. بە شێوەیەکی گشتی دەستنیشانکردنی ئۆتیزم هێشتا گفتوگۆی لەسەرە و ئامرازی جۆراوجۆر پێشنیار کراون بۆ دەستنیشانکردن. لە منداڵێ خوار دوو ساڵ و ئەوانەدا کە کەمتوانایی قسەیی و و عەقڵی زۆریان هەیە یاخود ئەوانەی لەم رووەوە کێشیەیەکی ئەوتۆیان نیە، دەستنیشانکردن کارێکی زەحمەتە. گەڕان بەدوای ئۆتیزمدا تا تەمەنی یەک ساڵی پێویست ناکات چونکە دەستنیشانکردنی لەو تەمەندەدا مومکین نیە بەڵام لە پاش تەمەنی ١٨ مانگی پێشنیار دەکرێت کە بەدواداچوون و پشکنینی بکرێت بۆ ئەو منداڵانیە گومانیان لێدەکریت لەبەرهەبوونی ئەو ئالا سوورانەی لە خشتەی ١ دا هاتوون.

بەمەبەستی لێگەڕان و دەستنیشانکردنی ئۆتیزم و بە مەبەستی توێژینەوە چەندین پرسنامە و ئامرازی لێگەڕان (Screening tools and questionnaires) ئامادەکراون لەسەر بنەمای پێناسە و نیشانەکانی ئۆتیزم وەک لە (DSM-IV) و (DSM-V) دا هاتوون و بۆ تەمەنە جیاوازەکان لە یەک ساڵی بەدواوە تا منداڵی و گەورەیی دەگونجێن کە باوترینیان ئەوانەی خوارەوەن (لیاڵ، ٢٠١٦؛ : ئۆتیزم کەنەدا، ٢٠٢٠). یەکێک لە باوترین ئام ئامرازانە ئامرازی ڕێنمای چاودێری بۆ دەستنیشانکردنی ئۆتیزم (ADOS) کە بریتییە لە لیستێکی ڕێنما بۆ چاودێریکردنی ڕاستەوخۆی منداڵ لەلایەن پسپۆری پەیوەندیدارەوە کە بەهۆیەوە ڕەفتارە ئۆتیستییەکانی منداڵەکە دیاری دەکات و نمرەی بۆ دادەنێت تا بزانێت ئەگەری ئۆتیزمی هەیە یان نا. یەکێکی تر، ئامرازی چاوپێکەوتن بۆ دەستنیشانکردنی ئۆتیزم-پێداوەچوو (ADI-R) پرسنامەیەکی نیمچە ڕێکخراوە بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ باوان و بەخێوکەر بەمەبەستی دیاریکردنی نیشانەکانی ئۆتیزم. ئەم دوو ئامرازە زۆرتر بەکاردەهێنرێن گونجاون بۆ دەستنیشانکردنی ئۆتیزم لە پێش تەمەنی ٣٠ مانگییەوە. بە هەمان شێوە چێکلیستی دەسکاریکراوی ئۆتیزم لە منداڵی تازەپێگرتوودا (M-)

CHAT) به ئامرازێکی باش دادنرێت له منداڵێ خوار ۳۰ مانگدا.

- Autism Diagnostic Observation Schedule (ADOS)
- The Autism Diagnostic Interview –Revised (ADI-R)
- Modified Checklist for Autism in Toddlers (M-CHAT
- Screening Tool for Autism in Toddlers and Young Children (STAT)
- The Childhood Autism Rating Scale (CARS)
- Ages and Stages Questionnaires (ASQ)
- Communication and Symbolic Behavior Scales (CSBS)
- Parent's Evaluation of Development Status (PEDS)
- The Social Responsiveness Scale
- The Childhood Autism Spectrum Test

## ٤

# بەربڵاوی و هۆیەکانی ئۆتیزم

وەک لە بەشەکانی پێشوودا باسمان کرد دەستنیشانکردنی ئۆتیزم کارێکی ئاڵۆزە بۆیە ئامارەکان بەتایبەتی لەو وڵاتانەدا کە سیستەمێکی چاودێری تەندروستیی چالاکیان نیە ورد و جێی باوەر نین. بەپێی تازەترین ئاماری سەنتەرەکانی پێشگیری و کۆنترۆڵی نەخۆشی لە ئەمەریکا (سی دی سی) کە داتاکای هی ٢٠١٦ یە ولە دە ولایەت کۆکراوەتەوە، تێکڕای بەربڵاویی ئۆتیزم لە ئەمەریکا بریتیە لە ١٨,٥ بۆ ١٠٠٠ کەس (واتە ١ لە ٥٦) لە ناو ئەو منداڵانەدا کە تەمەنیان ٨ساڵە بەلام جیاوازی هەیە لەنێوان ویلایەتەکاندا بە جۆرێک کەمترین بەربڵاوی بریتییە لە ١٣,١ لە کۆلۆرادۆ و زیاترینیش بریتییە لە ٣١,٤ لە ١٠٠٠ کەس لە نیوجێرسی (ماینەر، ٢٠٢٠). بەپێی ئەم ئامارەی ئەمەریکا بەربڵاوی لە کوڕاندا ٤,٣ ئەوەندی کچانە و جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان رەگەزی رەش و سپیدا نیە بەڵام لە رەگەزی هیسپانیکدا کەمترە (١٥,٤ لە ١٠٠٠) (ماینەر، ٢٠٢٠). ئەمە لەکاتێکدایە کە ئامارەکانی پێشووی سی دی سی رێژەیەکی کەمتریان نیشانداوە، بۆ

نموونه بەربڵاوی لە ئاماری ٢٠١٤ دا ١٦,٨ لە ١٠٠٠ (١ لە ٥٩) و ئاماری ساڵی ٢٠٠٠ زۆر لەوە کەمتری دەستنیشانکردبوو (١ لە ١٥٠ منداڵ). هۆی ئەم زیادبوونە مەرج نیە زیادبوونی ئۆتیزم بێت بەڵکوو زیاتر پێدەچێ بەهۆی چۆنێتی دەستنیشانکردنی ئۆتیزم و هۆشیاریی زیاتری کۆمەڵگاوە بێت سەبارەت بە کێشەکە. بەربڵاوی ئۆتیزم لە جیهاندا جیاوازە و پەیوەندی هەیە بە ناوچەو و میتۆدی توێژینەوە و دەستنیشانکردنەوە بۆیە ڕەنگە بەراوردکردنی ڕێژە ڕاپۆرتکراوەکان دروست نەبێت.

بەربڵاویی ئۆتیزم لە کەنەداش وەک هی ئەمەریکا بەرچاوە. بە پێی ئامارێکی نیشتمانی لە ساڵی ٢٠١٥ دا، بەربڵاویی ئۆتیزم لە مندالانی ٥-١٧ ساڵدا ١٥,٢ بۆ ١٠٠٠ کەسە واتە ١,٥% یان ١ لە ٦٦ منداڵ (ئاژانسی تەندروستی گشتیی کەنەدا، ٢٠١٨). لە کەنەداش وەک ئەمەریکا زۆرینەی تووشبووەکان نێرینەن بەجۆرێک بەربڵاوی لە کوڕدا چوار ئەوەندەی کچە و بەم پێیەش لە هەر ٤٢ کوڕی تەمەن ٥-١٧ ساڵ یەکێکیان وەک ئۆتیزم دەستنیشان کراوە بەڵام ئەم ڕێژەیە لە ناو کچانی هەمان تەمەندا یەک لە ١٦٥ کچە (هەمان سەرچاوە).

پێداچوونەوەی توێژینەوەکانی ناوچە جیاوازەکانی جیهان جیاوازییەکی ئێجگار زۆری لە ڕێژەی بەربڵاویدا

دەرخستووە لە ١,٤ لە دە هەزار کەس تا ٢٦٤ لە دە هەزار کەس کە ئەگەر هەموو بەسەر یەکەوە بخەمڵێنرێت تێکرا دەکاتە نزیکەی ٦٩ لە دە هەزار کەس کە ئەمیش دەکاتە ١ منداڵ لە ١٤٥ منداڵ (ماکدۆگڵ،٢٠١٦). بەم پێیە بەربڵاوی جیهانیی ئۆتیزم لە دەوروبەری ٧ لە هەزار کەسە (٠,٧%) ، بەڵام بەرزترین بەربڵاوی لە کۆریا تۆمار کراوە بە رێژەی ٢,٦% لە نێو منداڵانی تەمەن ٧-١٢ ساڵدا (لیال، ٢٠١٦). لەم سالانەی دواییدا بەهۆی دەستنیشانکردن و دۆکومێنتکردنی کاراترەوە پێدەچێ رێژەی ئۆتیزم لە زیادبووندا بێت وەک داتای ئەمەریکا و کەنەدا و وڵاتانی پێشکەوتوو نیشانی دەدات: لە سویدو فنلاند ریژەی ١% لە دانیمارک ١,٥% (لیال، ٢٠١٦).

لە ولاتانی داهات نزم و مامناوەندیدا ئاماری باوەرپێکراو کەمە دەربارەی بەربڵاوی ئۆتیزم. توێژینەوەیەکی ئێرانی سەبارەت بە مندالانی ٥ ساڵ باس لە رێژەی ٦,٢٣ بۆ دە هەزار منداڵ دەکات لەو ولاتەدا (سەمەدی، ٢٠١٢)، بەلام لە توێژینەوەیەکی ئەم دواییەی تورکیادا وا خەمڵێنراوە کە ١ لە ١١٧ مندالێ تەمەن ٢-٣ ساڵ لە تورکیا ئۆتیزمیان هەبێت (ئونەر، ٢٠١٩) و لەناو منداڵانی دایەنگاکانی لوبنانیشدا (تەمەن ١-٤ ساڵ) رێژەیەکی لەوە زیاتر کە بریتییە لە ١ لە ٦٦ منداڵ باسکراوە (چایا، ٢٠١٦).

هەرچەندە رەنگە توێژینەوە هەبن سەبارەت بە بەربڵاویی ئۆتیزم لە عێراق و کوردستان بەڵام ئێمە بە گەرانی ئەلکترۆنی هیچمان بەردەست نەکەوت. ئەوەی ئاشکرایە، لەبەر زەحمەتبوونی دەستنیشانکردنی ئۆتیزم و کەمیی خزمەتگوزاری و هۆشیاری تەندروستی و هۆی کۆمەلایەتی و هی تر، لە کوردستان ژمارەیەکی کەم لە منداڵانی ئۆتیزم دەکەونە بەر چاوی بایەخپێدەران و خزمەتگوزارییان پێشکەش دەکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا و بە لەبەرچاوگرتنی ئەو رێژانەی وڵاتانی دراوسێ بتوانین وای بخەملێنین کە ئەگەر لە کوردستان بەدواداگەڕانی باش بکرێت رەنگە لە سەد منداڵی تەمەن ٢ تا ١٢ ساڵ یەکێکیان ئۆتیزمی هەبێت کە ئەمەش بە نزیکەی چواردە هەزار منداڵ دەخەملێنرێت.

بەربڵاویی زۆری ئۆتیزم و پێویستیی درێژخایەنی بە بایەخی کۆمەڵایەتی و رەفتاری و تەندروستی و پیشەیی وای کردووە کە کێشەیەکی زیندوو بێت لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا و مایەی مشتومڕی بەردەوام بێت لەنێوان خێزان و دەسەلاتدا چونکە خزمەتگوزارییەکانی دەستنیشانکردن و چارەسەری ئۆتیزم کەموکوورییان زۆرەو وەک پێویست بەردەست نین تەنانەت لە وڵاتە پێشکەوتووەکانیشدا. هۆیەکی سەرەکی ئەمەش گرانیی تێچوونە چونکە زۆرجار خزمەتگوزارییەکان لەلایەن

کەرتی گشییەوە پێشکەش ناکرێن یان بیمە نایانگرێتەوە. تێچووی چاودێریی (هەموو لایانەکانی بایەخدان ) ئۆتیزم لە ولاتە پێشکەوتووەکاندا ئێجگار زۆرە، بۆ نموونە تێچووی ساڵانەی چاودێریی ئۆتییزم لە ولاتە یەکگرتووەکان بە ١١٢ ملیار دۆلار خەملێنراوە و تێچووی یەک کەسی ئۆتیزمیش بەدرێژایی تەمەنی لە ئەمەریکا بە ١,٤ تا ٣,٢ ملیۆن دۆلار و لە بەریتانیاش بە ٩٠٠٠٠٠ تا١,٥ ملیۆن پاوەند خەملێنراوە (دورانت،٢٠١٤).

ئۆتیزم کێشەیەکی ئاڵۆزە و میکانیزمە دەمارییەکانی بەرپرس لە کەموکوڕییەکانی ئۆتیزم و هۆکارەکانی هێشتا بەتەواوی روون نین بەڵام کاریگەریی هۆکاری بۆماوەیی و سەرووبۆماوەیی و هۆکاری دەرەکیی نابۆماوەییش تێبینی کراوە. میکانیزمی ئەوەی چۆن ئەم هۆکارانە کار لەیەکتری دەکەن و چەند رۆڵیان لە ئۆتیزمدا هەیە هێشتا مایەی لێکۆڵینەوەیە. هەندێ کێشە لە گەشەی دەماریدا تێبینی کراون لە هەندێ حاڵەتی ئۆتیزمدا وەک گەشەی زیادلەرادەی مێشک لە سەرەتادا، کێشە و لاوازێ فرمانی گەیاندن لەنێوان پێکهاتە جیاوازەکانی مێشکدا، و جیاوازی توێکاری لە هەندێ پێکهاتەی مێشکدا بەتایبەتی توێکڵی مێشک و مێشکۆڵە. جگە لەمانەش هەندێ کێشەی میتابۆلیزم و کۆئەندامی هەرس و سیستەمی بەرگریی

تیبینی کراون لە ڕێژەکی حاڵەتەکانی ئۆتیزمدا بەڵام ڕادە و چۆنێتیی کاریگەریی ئەمانە لەسەر ئۆتیزم و نیشانەکانی روون نین (لیاڵ، ٢٠١٦). هیچ بەڵگەیەکی باوەڕپێکراو نیە سەبارەت بە پەیوەندیی نیوان ئۆتیزم و چۆنێتیی پەروەردکردنی منداڵ، واتە شێوازی پەروەردەکردن ومامەڵەی خێزان لەگەڵ منداڵ کاریگەریی نیە لەسەر سەرهەڵدانی نیشانەکانی ئۆتیزم.

گومان لەوەدا نییە کە بۆماوە رۆڵێکی بەرچاوی هەیە لە سەرهەڵدانی ئۆتیزمدا. دووبارەبوونەوەی ئۆتیزم لە یەک خێزاندا روودەدات بەڵام مەرج نیە بنەما بۆماوەییەکە هەمیشە لە باوانەوە بگوازرێتەوە بۆ وەچە. دوو توێژینەوەی گەورە دەربارەی خوشک وبرای ئەو منداڵانەی ئۆتیزمیان هەیە دەریان خستووە دووبارەبوونەوەی ئۆتیزم لە خیزاندا ١٩%  تا ٢٧% دەبێت (ئاناگنۆستۆ، ٢٠١٤) هەرچەندە توێژینەوەی تر بە ٣-١٨% خەمڵاندوویانە (لیاڵ، ٢٠١٦). پێدەچی گۆرانکاری بۆماوەیی نوێ نەک هەبوونی جینی دیاریکراو لە باواندا بەرپرسی بەشێکی تر لە حاڵەتەکانی ئۆتیزم بێت و لە ئێستادا دەتوانرێت هۆی بۆماوەیی لە ١٠-٣٠% ی حاڵەتەکانی ئۆتیزمدا دەستنیشان بکرێت (ئاناگنۆستۆ، ٢٠١٤). لەو جینانەی کە پێدەچی

کاریگەربن وەک هۆکار لە ئۆتیزمدا ئەمانەن: . SHANK3, VNTN4, CNTNAP2, CHD2

ئێستا زیاتر بەڵگەکان ئامەژەیان بەرەو کاریگەریی کۆکراوەی چەندین رێچکەی بۆماوەییە نەک یەک جینی دیاریکراو واتە هەبوونی چەند جینیکی گۆڕاو (فرەجینی) رەنگە مەترسیی زیاتر دروست بکا بۆ ئەگەری ئۆتیزم (لیاڵ ، ٢٠١٦). لەم ساڵانەی دووایيدا لێکۆڵینەوەی سەرووبۆماوەیی بەدوای رۆڵی ئەم پرۆسەیەدا گەڕاوە لە ئۆتیزمدا. گۆرانکاریی سەرووبۆماوەیی پرۆسەیەکە کە هیچ گۆرانکارییەک لە رشتەی DNA واتە پێکهاتەی جینەکەدا روونادات بەڵام بەهۆی هەندێ مادەی کیمیایی کە بە جینەکەوە دەلکێن یا لە سەری دادەنیشن گۆڕانکاریی لە کارو ریکخستن (دەربڕین) ی جینەکەدا روودەدات. هەموو ئەو مادە کیمیاییانەی لە کۆی ماددەی بۆماوەییدا هەن، واتە لە جینۆمدا، بۆ رێکخستنی کاری جینەکان ناودەبرێن بە سەرووجینۆم. سەرووبۆماوەزانی (ئیپیجێنێتیک) زانستی لێکۆڵینەوەی ئەم پرۆسە سەرووبۆماوەییانەیە.

گۆڕانکاریی سەرووبۆماوەیی دەشێ بەهۆی هۆکاریی ژینگەییشەوە رووبدات وەک جۆری خۆراک و بەرکەوتنی ماددەی زیانبەخش. لیکۆڵینەوەی سەروو

بۆماوەیی ڕەنگە لەداهاتوودا بتوانێت ڕۆڵی هەندێ میکانیزمی سەرووبۆماوەیی و هۆکاری ژینگەیی لە ئۆتیزمدا ڕوونبکاتەوە یاخود بتوانیت زیندەنیشاندەر (بایۆمارکەر) دەستنیشان بکات بۆ ئۆتیزم. شایانی باسە دەرکەوتووە کەوا هۆکاری سەرووبۆماوەیی بەرپرسە لە هەندێ لەو نەخۆشییانەی کە نیشانەی هاوبەشیان هەیە لەگەڵ ئۆتیزمدا وەک کۆنیشانەی ڕێت و کۆنیشانەی ئێکسی ناسک و کۆنیشانەی ئەنگڵمان (لیاڵ، ٢٠١٦). بەهەرحاڵ، وەک وتمان هۆکاری بۆماوەیی تەنیا لە ڕێژەیەکی کەمیی حاڵەتاکانی ئۆتیزمدا تێبنی کراوە و بۆچوونی باو هێشتا ئەوەیە کە ئۆتیزم کێشەیەکی فرەهۆکارە و لە کاریگەریی بۆماوەیی و ژینگەییدا خۆی دەبینێتەوە.

سەبارەت بە هۆکارە ژینگەییەکان، لێکۆڵینەوەکان باس لە ژمارەیەک هۆکاری جیاواز دەکەن کە پەیوەندییان بە ژینگە و باوان و سەرەتاکانی لەدایکبوونی منداڵەوە هەیە. توێژینەوەکان ژمارەیەکی زۆر هۆکاری جۆراوجۆریان پێشنیار کردووە کە ڕەنگە بەجۆرێک ڕۆڵیان هەبێت لە دروستبوون و سەرهەڵدانی ئۆتیزمدا کە پەیوەندییان بە باوک و دایک و خۆراک و دەرمان و بەرکەوتنی مادەی کیمیایی و ئالوودەیی هەوا و هۆکاری تری دەوروبەرەوە هەیە (لیال،٢٠١٦؛ لیبۆیەر،٢٠١٥). لە کۆنەوە ڕاپۆرت

کراوە کە بارودۆخی نالەبار لە کاتی دووگیانیدا کاریگەریی لەسەر ئۆتییزم هەیە. تەمەنی باوان بەتایبەتی زۆریی تەمەنی دایک، بەڵام هی باوکیش، وەک یەکێک لە هۆکارەکانی سەرهەلدانی ئۆتیزم لە زۆر تویژینەوەدا دەستنیشانکراوە و میکانیزمەکەشی دەگێڕنەوە بۆ گۆرانی سەرووبۆماوەیی و زیادبوونی کێشەی بۆماوەیی و هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی نەخۆشی. بەهەمان شێوە کەمیی ماوەی نێوان دووگیانی وەک هۆکارێکی تر راپۆرت کراوە. هەندێ نەخۆشی دایک وەک نەخۆشیی خود بەرگریی (ئۆتۆئیمیوون) و سوورێژەی ئەڵمانی و تووشبوون بە سایتۆمیگالۆڤایرۆس لەکاتی دووگیانیدا پێدەچی مەترسیی ئۆتیزم لە کۆرپەدا زیادبکەن. لەدایکبوونی پێشوادە و کەمکێشی کۆرپە و گەورەیی ئەندازەی کۆرپە و لەدایکبوون بە عەمەلیات و سکپڕبوونی پاڵپشتکراویش وەک هۆکار باسکراون. بەکارهێنانی هەندێ دەرمان لەکاتی دووگیانیدا پێدەچی ئەگەری تووشبوون بە ئۆتیزم زیادبکات وەک هەندێ دەرمانی دژی فێ و خەمۆکی و شتی تر بەتایبەتی ڤالپرۆواتی سۆدیۆم، فینیتۆین، سالیدۆماید و میزۆپرۆستۆڵ. دەرمانەکانی دژەخەمۆکی لە گرووپی داکەوێنەری هەڵبژاردەیی هەڵگرتنەوەی سیرۆتۆنین پێدەچێ مەترسی ئۆتیزم زیادبکەن بەڵام توێژینەوەکان ئەنجامی جۆراوجۆر نیشان دەدەن (لیال،٢٠١٦).

هەرچەندە قسە لەسەر کاریگەریی خۆراک زۆرە بەڵام بەڵگەی باش بەدەستەوە نیە سەبارەت بە کاریگەریی خۆراکی دایک و ئۆتیزم مەگەر دەربارەی ترشی فۆلیک. پەیوەندی نێوان کەمی ترشی فۆلیک (فۆڵەیت) و هەندێ کێشەی گەشەکردنی دەماری وەک کەموکوڕیی بۆری دەماری لە کۆرپەدا دەستنیشانکراوە و هەندێ توێژینەوەش دەریان خستووە کەمی بەکارهێنانی فۆڵەیت لەکاتی دووگیانی و پێش دووگیانیدا مەترسیی ئۆتیزم زیاد دەکات. لەوەناچی جگەرەکێشان و بەکارهێنانی کحوول لەکاتی دووگیانیدا پەیوەندییان هەبێت بە ئۆتیزمەوە.

وەک یەکێک لە دیاردە باوەکانی ژینگە ، دەرکەوتوە کەوا ئالوودەیی هەوا کاریگەریی هەیە لەسەر ئەگەری ئۆتیزم لە کۆرپەی ئەو دایکانەدا کە لەکاتی دووگیانیدا بەرکەوتەیی زۆریان هەیە بە هەندێ لە پێکهاتە زیانبەخشەکانی هەوای ئالوودەوە وەک دووەم ئۆکسیدی نایترۆجین، ئۆزۆن و هەندێ جۆری گەرد و تۆزبە تیرەی کەمتری لە ١٠ مایکرۆمەتر. ئەم ئاوێتانە زیاتر لە هاتوچۆی ئۆتۆمبیلەوە سەرهەڵدەدەن بۆیە زیاتر مەترسین بۆ ئەو خێزانانەی لەشارە گەورەکان و لە نزیک ترافیکی زۆرەوە دەژین. جگە لەوەش بەرکەوتنی پێش لەدایکبوون بە ئافەتکوژ و مێرووکوژەکان وەک ئاوێتە ئۆرگانۆ کلۆر و ئۆرگانۆفۆسفۆرەکان کە لە کشتوکاڵدا بەکاردەهێنرێن،

دەرکەوتووە لەرێگەی چەندین میکانیزمەوە کاریگەریی نێگەتیڤ لە کۆئەندامی دەمار و گەشەی دەماری دەکەن و رەنگە مەترسیی ئۆتیزمیش زیادبکەن. بەهەمان شێوە ئەوەش زانراوە کە هەندێ لە کانزا قورسەکان وەک قورقوشم و جیوە، ژەهرن بۆ کۆئەندامی دەمارو ئەگەر منداڵ پێش لەدایکبوون یان لەسەرەتای منداڵیدا بەرکەوتەیی زۆری هەبێت بەم مادانە مەترسیی ئەوەی لێدەکرێت تووشی کەمبوونەوەی توانستی ژیریی و مەعریفی و و کەموکووریی فرمانی جێبەجێکردن و کەموریایی و فرەبزێوی ببێت. هەرچەندە پەیوەندی ئەم کانزا قورسانە بە ئۆتیزمەوە نەسەلمێنراوە بەڵام پرسیارەکە شایانی تێڕامان و توێژینەوەیە.

هەرچەندە قسەیەکی زۆر هەیە لەسەر کاریگەریی کوتانی منداڵ و هەندێ توێژینەوەی کۆنتریش باسیان لە رۆڵی کوتان کردووە لەسەر سەرهەڵدانی ئۆتیزم، بەڵام سەرجەم توێژینەوەکانی دواتر ئەوەیان پشتراست نەکردۆتەوە و هیچ بەڵگەیەکی وایان نەداوە بەدەستەوە سەبارەت بە ڕاستیی پەیوەندیی نێوان ئۆتیزم و پێکوتە (ڤاکسین) یا ئەو مادده پارێزەرانەی لە پێکوتەدا بەکاردەهێنرێن.

به کورتی ئەتوانین بڵێین ئۆتیزم کێشەیەکی فرەهۆکاریی ئاڵۆزە و پێدەچێ زۆرمان مابێت بە تەواوی لە هۆیەکانی تێبگەین. پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیای توێژینەوەی بۆماوەیی رەنگە بتوانێت تیشکی زیاتر بخاتە سەر ڕێچکە بۆماوەییاکانی ئۆتیزم و رۆڵی گۆرانکاریی جینی و فرەجینی و سەرووبۆماوەیی لە سەرهەڵدانی ئۆتیزمدا. توێژینەوەی زیاتر سەبارەت بەو هۆکارە ژینگەیی و دەرەکییانەی کە لەسەرەوە ناوبران و هۆکاری تریش، بێگومان لەداهاتوودا بەردەام دەبیت بەئۆمێدی تێگەیشتنی باشتر لەو هۆکارانەی کە قابیلی دەسکارین و دەکرێ لەرێگەیانەوە مەترسیی ئۆتیزم لە منداڵ و بەربڵاویی لە کۆمەڵگادا کەم بکرێتەوە.

***

## ٥

## ئۆتیزم و کێشە ئەقڵییەکانی تر

ئۆتیزم وەک پانتاییەک لە کێشەی پەرەسەندنی دەماری و رەفتاری لە ریزی کێشەکانی تەندروستی ئەقڵیدا پۆلێن دەکرێت. بۆچوونی باو بۆ نەخۆشی و کێشە عەقڵییەکان ئێستا زیاتر وایە کە ئەمانە بەناویەکدا چوون و زۆر جار دوو یان زیاتر لەم کێشانە هاوڕێ لەگەڵ یەکتردا روودەدەن واتە کەسی دووچار بە نەخۆشییەکەی ئەقڵی ئەگەری ئەوەی هەیە لەسەردەمێکدا دووچاری کێشەی تریش ببێت. ئۆتیزمیش لەم ریسایە بەدەر نیە و زۆرجار لە منداڵی یان گەورەییدا کێشە ئەقڵییەکانی تر لە کەسی دووچار بە ئۆتیزمدا سەرهەڵدەدەن. ئەمەش بەمانای ئەوە نیە ئۆتیزم هۆکاری ئەو نەخۆشییانەیە، بەڵکوو رەنگە پەیوەندیی بە هەندێ هۆکاری هاوبەشەوە هەبێت کە بەرپرسن یان رێخۆشکەرن بۆ ئەم نەخۆشییانە. لەوانەشە هەندی لەو کەموکووڕییە مەعریفی و رەفتارییانەی کە لە ئۆتیزمدا هەن رێ خۆشبکەن بۆ سەرهەڵدانی هەندێ کێشەی ئەقڵیی تر.

دەستنیشانکردنی کێشە و نەخۆشییە ئەقڵییەکان لە ئۆتیزمدا ئاڵۆزترە لە ئاسایی بەهۆی ئەوەوە کە ئۆتیزم خۆی مەودایەک لە نیشانە و کەموکوڕیی مەعریفی و رەفتاری و گەیاندن دەگرێتەوە بە جۆرێک رەنگە ببێتەهۆی پەی پێنەبردن، پشتگوێ خستن یان تێکەڵبوونی نیشانەی نەخۆشییە ئەقڵییەکانی ترکە سەرەنجام دەبێتە هۆی ئەوەی دەستنیشانکردن زەحمەتتر بێت. بەپێی هەندێ خەملاندنی توێژەران ٥٠-٧٠% ی ئەو کەسانەی ئۆتیزمیان هەیە لە ماوەی ژیانیاندا بەدەست لانی کەم نەخۆشییەکی تری ئەقلی-دەروونییەوە دەناڵێین (لیبۆیەر،٢٠١٥). هەندێک لەو کێشە ئەقڵییانەی هاورێ لەگەڵ ئۆتیزمدا روودەدەن ئەمانەن: کێشەی کەموریایی و فرەچالاکی، کێشەی فێربوون، کێشەی دووجەمسەری (خەمۆکی)، دڵەراوکێ، خووگرتن بە دەرمان، کێشەی رەفتاری، شیزۆفرینیا، و کێشەی کەسایەتی (لوبۆیەر،٢٠١٥؛ماکدۆگڵ،٢٠١٦).

کێشەی کەموریایی و فرەبزێوی (ADHD) حاڵەتێکی درێژخایەنە لە منداڵییەوە دەرکی پێدەکرێت و دەشێ بەردەوام بێت بۆ تەمەنی گەورەیی. نیشانە سەرەکییەکانی بریتین لە کەمی وریایی و گوێپێدان، چالاکی لە رادەبەدەر (بزێوی) و رەفتاری سەرکێشانە. ئەم مندالانە لەوانەیە کێشەیان هەبێت لە عیززەتی نەفس و پەیوەندی بەستن

لەگەڵ منداڵی ترو لە قوتابخانەش سەرکەوتوو نەبن. نیشانەکان رەنگە سووک تا دژوار بن و هەرچەندە زۆرجار بە تێپەرینی کات بەرەو باشی دەچن لەوانەیە لەتەمەنی گەورەییشدا بمێننەوە. رێژەی هاوڕوودانی ئۆتیزم و ئەی دی ئێچ دی بەرزە و بە ٣٠-٥٠% خەمڵێنراوەو لە کۆنەوە تێبینی کراوە، و لەبەرئەوەی دژواریی نیشانەکانی هەردوکیان مەودایەکی بەربڵاویان هەیە و لەیەکێشەوە نزیکن رەنگە ببنە مایەی سەرلێشێوان لە دەسنیشانکردندا هەرچەندە بەپێی دوو پێناسەکانی DSM دوو حاڵەتی جیاوزن و نابێ تێکەڵ بکرێن. هاوڕوودانی ئەم دوو حاڵەتە رەنگە بەهۆی هەندێ هۆکاری هاوبەشەوە بێت بەتایبەتی هۆکارە بۆماوەییەکان. بەهەرحاڵ دەستنیشانکردنی ئەی دی ئێچ دی لە منداڵی ئۆتیزمداردا گرنگە و پێویستە گومانی لێبکرێت ئەگەر منداڵ زیاد لە پێویست چالاک بێ و دڵ بە شت نەدا و رەفتاری کوروپڕ و سەرکێشی هەبێت هەرچەندە ئەمە هەمیشە کارێکی ئاسان نیە چونکە لەوانەیە دڵ پێنەدان کەمورییی بەهۆی حاڵەتی ترەوە بێت وەک خەمۆکی و دڵەراوکێ. چارەسەرکردنی ئەی دی ئێچ دی لە منداڵی ئۆتیستدا هەمان وەک منداڵی ئاساییەوە رەنگە پێویست بە دەرمان بکات.

کێشەکانی میزاج واتە خەمۆکی و کێشەی دووجەمسەری (خەمۆکی و مانیا) و دیسسایمیا (خەمۆکی درێژخایەن) لە کەسانی تووشبوو بە ئۆتیزمدا زیاتر دەبینرێن بەتایبەتی لە تەمەنی گەورەییدا. دیاریکردنی بەربڵاوی ئەم کێشانە لە ئۆتیزمدا ئاسان نیە چونکە ئەمانە زیاتر بە شێوازی کلینیکی واتە لە لایەن پزیشکەوە دەستنیشان دەکرێن و ئەوانەی بەم کێشانە دەستنیشان دەکرێن هەموو ئەو حاڵەتانە نەگرێتەوە کە رەنگە لە کۆمەڵگادا لەناو کەسانی ئۆتیزمدا هەبن. بەربڵاویی خەمۆکی و دیسسایمیا و کێشەی دووجەمسەری لە ئۆتیزمدا بە رێژەوی جۆراوجۆر دیاریکراوە کە لە رێژەی کەمترەوە تا ٥٠٪ دەگرێتەوە، و هەندێ توێژینەوە دەڵێن مەترسی روودانی کێشەکانی میزاج لە ئۆتیزمدا دە بەرابەری کەسانی ئاساییە (لیبۆیەر،٢٠١٥). سەرهەڵدانی خەمۆکی عادەتەن کوتوپڕ روودەدات و کەسوکار هەستی پێ دەکەن لەوەوە کە میزاجی منداڵ یا کەسەکە لەپڕێکا گۆڕانکاریی بەرچاوی بەسەردا دێت وەک ئەوەی لە کەسێکی سەرحاڵ و بەزەوقەوە دەگۆڕێت بۆ کەسێکی بێدەنگ و خەمبار بەڵام جاری واهەیە رەنگە ورووژان و هەڵچوونیش بنوێنێ بەتایبەتی ئەگە مانیای لەگەڵ بێت. ئەوکەسانەی ئەتوانن قسە بکەن رەنگە بە قسە دەری ببڕن و خۆیان بە خەمناک ناوبەرن بەڵام مەرج نیە هەموو کەسێکی ئۆتیست بتوانێت ئەو حاڵەتە دەروونییە بناسێتەوە.

نیشانیەکی تری خەمۆکی گۆڕانی هەڵوێستە بەرامبەر بە خود، بۆ نموونە هەرزەکارێکی ئۆتیزمدار رەنگە هەڵوێستی نێگەتیف بەرامبەر بەخۆی دەربڕێت (کە پێشتر وانەبووە) وەک ئەوەی بڵێت "کەس منی خۆش ناوێ"، یان "من بەکەڵکی هیچ نایەم" یان "من ناتوانم هیچ شتێک بە باشی ئەنجام بدەم" (ماکدۆگڵ،٢٠١٦). لە حاڵەتی دژواری خەمۆکیدا لە تەمەنی گەورەدا مەترسی هەوڵی خۆکوشتن و خۆکوشتن هەیە.

نیشانەیەکی تری ئۆتیزم کە دەکرێ کەسوکار تێبینی بکەن و نیشاندەرێکی باش بێت بۆ ئەگەری ئۆتیزم بەتایبەتی لەو منداڵ و کەسانەدا کە تواناى قسەکردنیان نیە گۆرانکاری ژیانی رۆژانەیە وەک تێکچوونی ریتمی خەو و بێخەوی، بێتاقەتی و کەمبوونەوەی وزەو چالاکی، و کەمبوونەوەی ئارەزوو بۆ ئەو کارو شتانەی پێشتر خۆی پێوە خەریک کردوون و چێژی لێ بینیون. منداڵی خەمۆک رەنگە تاقەتی چوونە دەرەوی نەمێنێ، حەزناکات بچێ بۆ خوێندنگا، یارییە دڵخوازەکەی بکات، یا تەنانەت لەوانەیە ئیشتیهای کەم بێتەوە و کێشی دابەزێ.

نیشانەکانی خەمۆکی لە کەسانی ئۆتیزمدا جیاواز نین لە کەسانی ئاسایی، کێشەکە عادەتەن درێژخایەن نیە بەڵکوو تاوتاوە هەرچەندە رەنگە هەندێ جار ببێت بە

حاڵەتێکی درێژخایەن.  چارەسەری خەمۆکی لە کەسانی ئۆتیزمدا بەهەمان شێواز و دەرمانی کەسانی ئاساییە هەرچەندە بەدواداچوون و وریایی زیاتر پێویستە لەلایەن پزیشک و کەسوکارەوە بۆ چۆنێتی بەکارهێنان و ئاگاداروبوون لە کاریگەری و کاریگەرییە لاوەکییەکان.

رەنگە هەندێ کەسی ئۆتیزم تووشی کێشەی دووجەمسەری ببن کە عادەتەن لە دوای باڵقبوونەوە روودەدات گەرچی بۆی هەیە زووتریش سەرهەڵبدات. کێشەی دوو جەمسەری بەوە دەناسرێتەوە نەخۆش هەندێ کات زۆر و وروورژاو و چالاکە و زیاد لە رادە باوەڕی بەخۆی هەیە وەک ئەوەی هەر بێت و بچێ، زۆر قسە بکات،یا شەو بێداربێت ، بەڵام ئەم دۆخە زۆر ناخایەنێ و دەگۆڕی بە دۆخی بێ میزاجی خەمباری و تەنانەت گریان و پەشیمانی. سەرهەڵدانی کێشەی دووجەمسەری زیاتر لە دووای باڵق بوون دەبێت لەکەسێکدا کە پێشتر کێشەی خەمۆکی یان دڵەراوکێی هەبووە. پێدەچی هەندێ خاسیەتی ئۆتیزم  ئەگەری روودانی خەمۆکی لە کەسی ئۆتیزمدا زیادبکەن لەوانەش ئەگەر کەسەکە توانای مەعریفیی باشتر بێت، لەرووی توانستی پەیوەندیکردنی کۆمەلایەتییەوە کەمتر کێشەی هەبێت، یان ئەگەر نەخۆشیی ئەقڵیی تری هەبێت. جگە لەمانەش لەوانەیە

هەندێ هۆکاری هاوبەش هەبێت بۆ هەردوو حاڵەتی ئۆتیزم و خەمۆکی (لیبۆیەر،٢٠١٥).

یەکێکی تر لە کێشەکانی تەندروستیی ئەقڵی لە کەسی ئۆتیزمدا دڵەراوکێیە. بێگومان دلەراوکێ کێشەیەکی باوە لە کۆمەلگادا بۆیە سەیر نیە ئەگەر لە ئۆتیزمیشدا باوبێت. لەراستیدا دڵەراوکێ زیاتر لە خاسیەتێکی ئۆتیزم دەچێت تا کێشەیەکی سەربەخۆ و تەنانەت لە پێناسە کۆنەکانی ئۆتیزمدا یەکێک بوو لە نیشانە سەرەکییەکان. زۆرکەسی ئۆتیزم، بە منداڵیشەوە، نیشانەکانی دڵەراوکێ دەنوێنێت وەک ئارەقکردنەوی لەپی دەست، مەراق، پەریشانی، ئۆقرەنەگرتن، دڵپێنەدان و خەیاڵ رۆشتن، کەمخەوی، هەلچوون، نینۆک کرتاندن، گازگرتن، زمانگرتن، خۆئازادان و پەلامار.

دڵەراوکێ لەوانەیە لە زۆر بارودۆخ و بەهۆی زۆر شتەوە رووبدات یان دژوارتر بێت وەک میوانداری و کۆبوونەوەی کۆمەڵایەتی، ویستنی شتێکی گرنگ، ونکردنی شتێکی گرنگ، دەنگەدەنگ و ژاوەژاو، گریانی منداڵ، دەمەقاڵەی دایک و باوک، پلان گۆڕین، چاوەروانی و سەردانی پزیشک (ماکدۆگڵ،٢٠١٦). دڵەراوکێ لەوانەیە بەهۆی ترسیشەوە روبدات وەک ترس لە سەگ و مێروو و بەرزاییو هەرشتێکی تر. وەک چۆن

لە کەسانی ئاساییشدا روودەدات، لەوانەیە ترسەکە زیاد لە رادەبێت و ببێت بە فۆبیا (ترسی ناماقووڵ).

ڕێژەی بەربڵاویی دڵەراوکێ لە ئۆتیزمدا بە ١١-٨٤% خەمڵێندراوە لە توێژینەوە جیاوازەکاندا (لەبۆیەر،٢٠١٥) کە ئەمەش مەودایەکی فراوانەو رەنگە پەیوەندیی بە پێکهاتەی سامپڵی تویژینەوەکانەوە هەبێت لەرووی تەمەن و خاسیەتە دیمۆگرافییەکانی ترەوە سەرەرای ئەو ئامرازانەی بەکارهێنراون بۆ پێوانی دڵەراوکێ. کێشەی وەسواسی پێناچێ لە ئۆتیزمدا باو بێت هەرچەندە هەندێ لە رەفتارەکانی ئۆتیزم (رەفتاری دووبارەو سنووردارکەر) لە نیشانەی کێشەی وەسواسی دەچن.

لە کۆنەوە شیزۆفرینیا وئۆتیزم پێکەوە هاوشانی یەک باس کراون لەبەرئەوەی هەندێ لە نیشانەکانی شیزۆفرینیا لە کەسی ئۆتیزمدا تیبێنیکراون بەتایبەتی لە تەمەنی هەرزەکاری و گەورەییدا. جگە لەوەش وێنەی زاڵی ئۆتیزم وەک منداڵێکی گۆشەگیر و تەنیا لە کۆنەوە وەک شیزۆفرینیای منداڵی یا رێخۆشکەر بۆ شیزۆفرینیا لە تەمەنی گەورەییدا سەیرکراوە. بەهەرحاڵ ئۆتیزم و شیزۆفرینیا دوو کێشەی تەواو جیاوازن و دەستنیشانکردنی هەردوو کێشەکە لە یەک کەسدا پێویستی

به هەبوونی نیشانە سەرەکییەکانی هەردوو نەخۆشییەکە هەیە. بۆ نموونە ئەگەر هەرزەکارێک کە ئۆتیزمی هەیە بۆ ماوەی یەک مانگ یا زیاتر هەلوەسەی هەبێت رەنگە شیزۆفرینیاشی هەبێت.

رێژەی روودانی شیزۆفرینیا لە ئۆتیزمدا بە نزیکەی ٨% خەملێندراوە (لیبۆیەر،٢٠١٥). یەکێک لە نیشانە باوەکانی شیزۆفرینیا وەهم و هەلوەسەیە، هەلوەسە بەتایبەتی هەلوەسەی بیستن رەنگە لە هەرزەکار و گەورەدا رووبدات ئەوانەی دووچاری کێشەی خەمۆکی گەورەن، لە شێوەی دەنگ و فەرمانی خەفەتباردا وەک "تۆ نابی بە هیچ!" ، "تۆ فێری هیچ نابی!" یا تەنانەت فەرمانی خۆکوشتن "خۆت بکوژە باشترە!" جگە لە هەلوەسە، کاتاتۆنیا کە یەکێکی ترە لە نیشانەکانی شیزۆفرینیا، لە ئۆتیزمدا بینراوە، بۆ نموونە نەخۆش لە حالەتێکی دیریکراوی سەیردا بێجووڵە دەوەستێت بێ ئەوەی قسە بکات یا وەڵام بداتەوە وە ناشهێڵێت حاڵەتەکەی بگۆڕیت. لاسایی کردنەوەی بێمانای قسەو جووڵەی کەسێکی تریش جۆرێکی کەمتر باوی کاتاتۆنیایە.

کێشەی کەمتوانایی فێربوون و دواکەوتنی ئەقڵی لە ئۆتیزمدا زۆر باون هەرچەندە ئەو منداڵانەی بە پێناسەی نوێ دەکەونە بەر پۆلێنی کێشەی پانتایی ئۆتیزم لە رووی

توانای فێربوون و پلەی زیرەکییەوە هەموو جۆرێک دەگرنەوە هەر لە منداڵی زۆر زیرەک واتە بلیمەت تا ئاسایی و تا دواکەوتنی توانای فێربوونی کەم تا ئێجگار زۆر. ئەو منداڵانەی بە کۆنیشانەی ئەسپێرگەر دەستنیشان دەکرێن توانای فیربوونیان ئاسایی تا سەروو ئاساییە. بە شێوەیەکی گشتی ئەو منداڵانەی کێشەی بۆماوەییان هەیە وەک کۆنیشانەی ئێکسی ناسک توانای فێربوونیان سنووردارە.

رێژەی بەربلاویی کەمتوانیی فێربوون لە ئۆتیزمدا بەرزەو توێژینەوەکان بە ٢٥-٤٠% خەملاندوویانە هەرچەندە رێژەی ٧٥% یش تۆمار کراوە (لیبۆیەر،٢٠١٥). بەپێی دوا ئاماری ئۆتیزمی سی دی سی لە ئەمەریکا لەناو ئەو منداڵانەدا کە زانیاری پلەی زیرەکییان تۆمارکراوە، ٣٣% کەمتونایی فێربوونیانە هەبووە (پلەی زیرەکی ٧٠% یا کەمتر)، ٢٤% تونای فیربوونیان لەسەرلێوار بووە (پلەی زیرەکی ٧١-٨٥)، وە ٤٢% یان توانای فێربوونیان ئاسایی یا سەروو ئاسایی بووە (پلەی زیرەکی سەروو ٨٥ ) (ماینەر،٢٠٢٠). بەشێوەیەکی گشتی هەبوونی کەمتوانایی فێربوون لە منداڵی ئۆتیزمدا نیشانەی دژواریی زیاتری کێشەی ئۆتیزمەکەشە و رەنگە ئەگەری هەبوونی کێشەی ئەقڵی و دەروونی تریش وەک خەمۆکی و دڵەراوکێ زیاتر دەکات.

لەوەش ناچێ بەتێپەرینی کار گۆرانکاری لە پلەی زیرەکیدا رووبدات نە بەرەو باشتر نە بەرەو خراپرتر(لیبۆیەر،٢٠١٥) .

رەفتاری نائاسایی یا نەگونجاو لە ئۆتیزمدا زۆرە. ئەو خاسیەتەی کەسی ئۆتیزم مەراق و ئارەزووی زیاد لە رادەی سەبارەت بە هەندێ شتی دیاریکراو هەیە بۆی هەیە ببێتە هۆی هەندی کار و رەفتاری ناشایستە و زیانبەخش. وەک لە بەشەکانی پێشوودا باسمان کرد منداڵی ئۆتیزمدار جاری واهەیە مەراقی ناماقووڵی لە شتێکی دیاریکراوە بە پیی تەمەنی وەک کەلوپەلی یاری، مەدالیای کلیل، دیناسوور، کەسایەتییەکی ناسراو، بابەتێک، چەک یا هەر شتیکی تر. ئەو مەراقە زیادەیە رەنگە وای لێ بکات نەتوانێ گوێ بە شتی تر بدات یا فێر ببێت، کاتی زۆری پێوە بەفیڕۆ بدات، یا ئەوشتانە لەکەسی تر داگیر بکات یا تەنەانت بایندزێت. لەهەمان کاتدا ئەوکاسانەی کە لەڕووی توانای ئەقڵییەوە کێشەیان نیە رەنگە سوود لەم خاسیەتە وەربگرن لە ڕووی کارەوە و ببن بە پسپۆر لە بواری ئەو شتەدا کە مەراقیانە. مەراقکردن بە چەکەوە مەترسیدارە چونکە لەوانەیە زەبروزەنگی لێبکەوێتەوە و زیان بە خۆی یا خەڵکی تر بگەیەنێت.

ڕەفتاری خۆراکی کێشەیەکی ترە لە ئۆتیزمدا چونکە ئەمانە وەکوو خەڵکی تر هەموو شتێک ناخۆن بەڵکوو مەودای جۆری خۆراکیان تەسکە خووئەگرن بە هەندێ خۆراکی دیاریکراوەوە لەڕووی جۆرو شێواز (تێکسچەر) و ڕەنگەوە. بۆ نموونە ڕەنگە زیاد لە ڕادە حەزی لە هێلکە بێت بەلام بە تەنیا بە جۆریکێ دیاریکراو ئامادەکرابێت. ئۆتیزم زۆر حەزیان لە میوە و سەوزە نیە. ئەم سنووردارییەی جۆری خواردن ڕەنگە ببێتە هۆی بەدخۆراکی لە رووی هەندێ پێکهاتەی گرنگی خۆراکەوە.

لەڕووی ڕەفتاری کۆمەڵایەتیەوە، ئۆتیزم کێشەی زۆرە کە لە جەهێڵی و هەرزەکاریدا زیاتر دەردەکەوێ چونکە نازانێ چۆن بە شێوەیەکی مەقبوول لە رووی کۆمەلاتییەوە مامەڵە لەگەڵ هاوپۆل و هاوڕێکنیدا بکات. لەم ڕووەوە کەسی ئۆتیزم وەک ساویلکە دەردەکەوێت و ئەم ساویلکەییە کۆمەلایەتییە ڕەنگە کێشەی بۆ دروست بکات. بۆ نموونە لەوانەیە ببێتە مایەی گاڵتەی هاوڕێکانی و هاوپۆلەکانی سەربخەنە سەری و عەزیەتی بدەن. یاخود هەرزەکار ڕەنگە حەزبکات وەک ئەوانی تر پەیوەندی لەگەڵ کچێکدا ببەستێت بەڵام نازانێت چۆن ئەم کارە بکات و چیبڵێت، لەوانەیە بەشێوەی ناشایستە، بە قیرسچمەیی و تۆپزی هەوڵ بدات و واز نەهێنێت کە ئەمەش ڕەنگە لە

قوتابخانە یا لە دەرەوە کێشەی کۆمەلایەتی و لێپرسینەوەی بۆ دروست بکات. ئەم جۆرە رەفتارە نائاسایی و ساویلکانە لە تەمەنی هەرزەکاریدا لەوانەیە بواری سێکسیش بگرێتەوە چونکە هەرزەکار یا لە لایەنی کۆمەلایەتی رەفتارەکە تێناگات یان ناتوانێ کۆنترۆڵی خۆی بکات. هەرزەکار بۆی هەیە تووشی رەفتاری سیکسی نەگونجاو ببێت وەک خووگرتن بە پۆرنۆگرافییەوە، دەسپەڕکردن بە ئاشکرا، پەیوەندی سێکسی نەگونجاو یا زیانبەخش.

رق هەستان و تەقینەوەا لە ئۆتیزمدا باوە کە جاری واهەیە بەهۆی شت و هەلوێستی سادەوە روودەدات وەک ئەوەی شتێکی دیار نەبێت، رۆتینێک گۆڕابێت یا خواردنێکی بەدڵ نەبێت یا هەست بکات غەدرێکی لێکراوە. هەندێ جار ئەم رەفتارانە رەنگە ببنە هۆی زیان بە خۆ گەیاندن وەک خۆ بریندارکردنی مەترسیدار بە تایبەتی لەوانەدا کە توانای فێربوونیان زۆر خوار ئاساییە.

زیان بە خۆگەیاندن بە زۆر شێوە روودەدات وەک سەر بە دیواردا کێشان، گاز لە خۆ گرتن، پێست رووشاندن. ئەم رەفتارانە زۆرکات زیان بە ماڵ و موڵکیش دەگەیەنن وەک دیوار و دەرگا و پەنجەرە و و پەرژین و شتومەکی ناوماڵ. زۆر خێزانی ئەو کەسانەی رەفتاری لەمجۆرەیان هەیە ناچار دەبن بۆ سەلامەتی

منداڵەکەیان بۆ پاراستنی ماڵ و کلوپەلەکان نۆژەنکردنەوە لە خانووەکانیاندا بکەن.

٦

## چارەسەری ئۆتیزم

لەبەرئەوەی ئۆتیزم پانتاییەکە لە کەموکووڕی لە رووی توانستی پەیوەندی کردنی بەرامبەر و کۆمەلایەتی و رەفتاری دووبارە و زۆرجار کەمتوانایی فێربوونەوە بە رێژەی دژواریی جیاواز، چارەسەرکردنی تا ئێستاش کارێکی زەحمەت و درێژخایەنە. هیچ دەرمانێکی دیاریکراو نیە بۆ چارەسەری ئۆتیزم یا رێگرتن لە سەرهەڵدان و بەردەوامبوونی نیشانەکانی. بەهەمان شێوە هیچ تاقە شێوازێک یا میتۆدێکی دیاریکراویش نیە بۆ چارەسەری ئۆتیزم چ لە منداڵی و تەمەنی گەورەتردا. ئەوەی هەیە بریتییە لە بۆچوون و میتۆدی جۆراوجۆر بۆ پاڵپشتکردنی کەسی ئۆتیزم و خێزانەکەی کە دەکرێ بەپێی بارودۆخ و نیشانەکان جێ بەجێ بکرێن.

هیچ دەرمانێک نیە بۆ چارەسەری نیشانە سەرەکییاکانی ئۆتیزم بەڵام هەندێ لە کێشەو نیشانانەی کە لەسەرەو باس کران و رەنگە لە هەندی کەسی ئۆتیزمدا دەربکەون زۆر جار پیویستیان بە دەرمان هەیە بۆ کۆنترۆڵ کردن و کەمکردنەوەی نیشانەکان و باشرتر

کردنی کواڵیتی ژیانی کەسەکە و کەسوکاری. ئەو نیشانانەی پەیوەندیان بە لایەنی دەروونی و رەفتاریی و هەندێ لایەنی جەستەییەوە هەیە وەک فێ و تێکچوونی خەو و خەمۆکی و رەفتاری توندوتیژ و زیان بە خۆ گەیاندن و کێشەی کەموریایی فرەبزێوی (ئە دی ئێچ دی) رەنگە پێویست بە چارەسەری دەرمانی بکات کە ئەمەش پێویستە پاش هەڵسەنگاندنی ورد و لەلایەن پزیشکی شارەزاوە بریاری لەسەر بدرێت. وا خەمڵێنراوە کە نزیکەی نیوەی کەسانی دووچاری ئۆتیزم چارەسەری دەرمانی وەردەگرن (لیبۆیەر، ٢٠١٥). بەکارهێنانی دەرمان لەگەڵ تەمەندا زیاد دەکات. توێژینەوەی زیاتر باس لەوە دەکەن کەوا تا تەمەنی هەشت ساڵی ٦٠-٧٠% ی ئەو منداڵانەی ئۆتیزمیان هەیە دەرمانیان بەکارهێناوە بۆ کێشەی رەفتاری و دەروونی-ئەقڵی (ماکدۆگڵ:،٢٠١٦). سۆزداری. ئەم دەرمانانە زیاتر دەرمانی دژەدەروونی (ئەنتیسایکۆتیک) و دەمارین و پێویستە بە وریایی و لە ژیرچاودیریی دەروونپزیشکدا باکاربهێنرین. سەرکەوتوویی بەکارهێنانی دەرمان قسەی زۆری لەسەرە و هەمیشە دڵخۆشکەرنین. هەندی بەخیوکەرلێیان رازین بەڵام هیتریش هەن کە بەگومانن لێیان بەڵام هەموویان نیگەرانن لە کاریگەریی لاوەکیی دەرمانەکان وە زیادبوومی کێش و بێحاڵی و هێڵنج و کەمبوونەوەی وریایە لایەنی مەعریفی (لەیک، ٢٠١٥).

بەشیوەیوکی گشتی ئەو منداڵانەی دەرمان وەردەگرن پێویستیان بە چاودیری و بەدواداچوونی باش هەیە لەیان کەسوکارو پزیشکەکانیاینەوە بۆ ڵنیا بوون لە کاریگەریی دەرمانەکان و کاریگەریی لاوەکییان ریکوپێکیی بەکار هێنانیان.

مادام هۆیەکی دیاریکراو نیە بەرپرسی نیشانەکانی ئۆتیزم بێت و کەسی ئۆتیست هەندێ کەمووکووڕیی دیاریکراوی هەیە لە رووی پەیوەندیکردن و رەفتارەوە کەواتە لۆژیکییە چارەسەری ئۆتیزم جەخت لەسەر باشترکردنی هەمان ئەو کەموکووڕییانە بکاتەوە نەک هۆ و فاکتەرێکی دیاریکراو. ئەم بۆچوونە بەو مانایەیە کە ئامانجی چارەسەرچاکبوونەوە نیە بەو مانایەی لە زۆر نەخۆشیی تردا هەوڵی بۆ دەدرێت بەڵکو ئامانجی هەر چارەسەرێک بۆ ئۆتیزم بریتی دەبێت لە فیربوونی هەندێ توانست شارەزایی و رەفتاری نوێ، کەمکردنەوەی کۆسپی بەردەم فێربوون، باشترکردنی توانای ئەنجامدانی فرمانەکان و بەشێوەیەکی گشتی کەمکردنەوەی کاریگەریی نیشانەکان لە سەرمنداڵ و کواڵیتی ژیانی.

ئەم چارەسەرانە چارەی رەفتاری و فێرکاری و ڕاهێنانن و پێویستە بەزووترین کات پاش دەستنیشانکردن بەکاربهێنرێن بەشێوەیەکی رێکو پێک بۆ ئەوەی

کاریگەربن. ئەم راستییە بەو مانایەشە کە پێویستیی کەسی ئۆتیزم بۆ پرۆگرامەکانی چارەسەر لەگەڵ کاتدا گۆڕانکاری بەسەردا دێت و پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە. سەرکەوتنی هەر چارەسەرێک یا پرۆگرامێک پشت دەبەستێت بە هەڵسەنگاندنی تێروپڕی بارودۆخی منداڵەکە و راوێژ لەگەڵ باوان و بەخێوکەر و راهێنانی پێویست و باشداریکردنیان لە پلاندانان و جێبەجێکردنی بەرنامەکدا. ئامانجی چارەسەر لە منداڵی پێش قوتابخانەدا بریتییە لە باشترکردنی توانستی زمان و مەعریفی و توانستی راهاتن لەگەڵ خەڵک و دەوروبەردا.

کەسی ئۆتیست پێویستی بە پرۆگرامی جۆراوجۆر هەیە بۆ چارەسەری ئەو پێداویستییانەی کە کەموکووڕییان تێدایە. زۆربەی کات کەسی ئۆتیزمدار لە قۆناغەکانی ژیاندا پێوسیستی بە کۆمەڵێک پرۆگرام و راهێنان هەیە بەپێی بارودۆخی کە رەنگە یەک یا زیاتر لەمانەی خوارەوە بگرێتەوە:

١. پرۆگرامێکی راهێنانی تایبەت و رێکخراو لەسەر بنەمای رەفتارناسی کە کۆمەڵێک بەرنامە لەخۆدەگرێ کە بە گشتی پێی دەوترێ رەفتارشیکاریی کارەکی (ABA=Applied Behaviour Analysis). ئەم پرۆگرامە ئێستا باوترین و کاریگەرترین چارەسەرە

لەسەرەتای منداڵیدا. چەندین پێداچوونەوەی ئەو توێژینەوانەی لەسەر رفتارشیکاریی کارەکی کراون کاریگەریی باشی ئەم بەرنامەیەیان دەرخستووە بۆ باشترکردنی نیشانەکانی منداڵ بەتایبەتی ئەگەر بە شێوەیەکی چروپڕ و لە سەرەتای منداڵیدا بۆ ماوەی ٢-٣ ساڵ بەکاربهێنرێت (ئەناگتنۆستۆ،٢٠١٤).

٢. چارەسەری قسەو زمان بۆ باشترکردنی توانای قسەکردن و گەشەپێدانی زمان و چۆنێتی گەیاندن و پەیوەندی کردن لەگەڵ خەڵکدا.

٣. چارەسەری پیشەیی بۆ ئەو کەموکورییانەی پەیوەندییان بە هەستکردن و ئەندامەکانی هەست و توانستی جووڵەوە هەیە.

٤. ئەو بەرنامانەی تایبەتن بە باشترکردنی بواری کۆمەلایەتی و یاریکردنەوە.

٥. ئەو بەرنامانەی تایبەتن بە باشترکردنی توانستەکانی ژیان (Life Skills) و توانستی فرمانکردن.

٦. راوێژکاری و چارەسەری دەروونی کەسی ئۆتیزم بۆ مەبەستە جیاوازەکان.

****

# سەرچاوەکان

1. Anagnostou E, Zwaigenbaum L, Szatmari P, Fombonne E, Fernandez BA,Woodbury-Smith M, Brian J, Bryson S, Smith IM, Drmic I, Buchanan JA, Roberts W,Scherer SW. Autism spectrum disorder: advances in evidence-based practice. CMAJ. 2014 Apr 15;186(7):509-19. doi: 10.1503/cmaj.121756. Epub 2014 Jan 13. Review.PubMed PMID: 24418986; PubMed Central PMCID: PMC3986314

2. Autism Canada (2020) Screenining Tools. Avaiable at: https://autismcanada.org/about-autism/diagnosis/screening-tools/?gclid=Cj0KCQjw17n1BRDEARIsAFDHFey7B-iudMd6bWDpL3KTBJWLrMQfheD9eigp4ZrHNbwsZ56Nck-dmR4aAhK_EALw_wcB

3. Autism Ontario (2019). The Autism Parent Resource Kit. Available at: http://www.children.gov.on.ca/htdocs/English/documents/specialneeds/autism/aprk/Autism_Parenting_Kit_English.pdf

4. Carpenter, Laura (2013). DSM5 Autism spectrum disorder: guidelines & criteria exemplars. Available at: https://depts.washington.edu/dbpeds/Screening%20Tools/DSM-5%28ASD.Guidelines%29Feb2013.pdf

5. CDC (2020). Autism Spectrum Disorder. https://www.cdc.gov/ncbddd/autism/screening.html

6. Chaaya M, Saab D, Maalouf FT, Boustany RM. Prevalence of Autism Spectrum Disorder in Nurseries in Lebanon: A Cross

Sectional Study. J Autism Dev Disord. 2016 Feb;46(2):514-22. doi: 10.1007/s10803-015-2590-7. PubMed PMID: 26362151.

7. Durand, V. Mark (2014) Autism spectrum disorder. Washington: American Psychological Association

8. Evans, B. (2017) The metamorphosis of autism: A history of child development in Britain. Manchester: Manchester University Press

9. Evas, Bonnie (2017). The metamorphosis of autism. Manchester: Manchester University Press

10. Lake, J. K., Milovanov, A., Sawyer, A., & Lunsky, Y. (2015). Parent perspectives on psychotropic medication use and interactions with prescribing health care providers among adolescents and adults with an autism spectrum disorder. Focus on Autism and Other Developmental Disabilities, 30(3), 165-173. doi:http://dx.doi.org/10.1177/1088357614559215

11. Leboyer, M. and Chaste, P. [Ed] ( 2015) Autism Spectrum Disorder: Phenotypes, Mechanisms and Treatments. Basel: Karger

12. Lyall K, Croen L, Daniels J, Fallin MD, Ladd-Acosta C, Lee BK, Park BY, Snyder NW, Schendel D, Volk H, Windham GC, Newschaffer C. The Changing Epidemiology of Autism Spectrum Disorders. Annu Rev Public Health. 2017 Mar 20;38:81-102. doi: 10.1146/annurev-publhealth-031816-044318. Epub 2016 Dec 21. PMID: 28068486; PMCID: PMC6566093.

13. Maenner MJ, Shaw KA, Baio J, et al. Prevalence of Autism Spectrum Disorder Among Children Aged 8 Years — Autism and Developmental Disabilities Monitoring Network, 11 Sites, United States, 2016. MMWR Surveill Summ 2020;69(No. SS-4):1–12. DOI: http://dx.doi.org/10.15585/mmwr.ss6904a1external icon

14. McDougle, Christopher [Ed] (2016). Autism Spectrum Disorder. Oxford: Oxford University Press.

15. Mintz M. Evolution in the Understanding of Autism Spectrum Disorder: Historical Perspective. Indian J Pediatr. 2017 Jan;84(1):44-52. doi: 10.1007/s12098-016-2080-8.

16. Murray, Stuart (2012). Autism. New York: Routledge

17. Oner O, Munir KM. Modified Checklist for Autism in Toddlers Revised (MCHAT-R/F) in an Urban Metropolitan Sample of Young Children in Turkey. J Autism Dev Disord. 2019 Aug 14. doi: 10.1007/s10803-019-04160-4. [Epub ahead of print] PubMed PMID: 31414260; PubMed Central PMCID: PMC7065507.

18. Perepa, Prithvi (2019). Autism, Ethnicity and Culture: Working with families and Children from Minority Communities. London: Jessica Kingsley Publishers

19. Public Health Agency of Canada. Autism Spectrum Disorder among Children and youth in Canada 2018: A report of the national Autism Spectrum Disorder surveillance system. Ottawa: Pubic Health Agency of Canada. 2018

20. Samadi SA, Mahmoodizadeh A, McConkey R. A national study of the prevalence of autism among five-year-old children in Iran. Autism. 2012 Jan;16(1):5-14. doi: 10.1177/1362361311407091. Epub 2011 May 24. PubMed PMID: 21610190.

*****

